# ریشەو پیشینەی رێبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا

د. هەڵکەوت مەلا حەکیم خانەقینی

کاتیك لەشکرەکانی شا عەباسی سەفەوی لە سالی 1514دا لە دەشتی چالدیرانی باکوری خۆرئاوای زەریاچەی ورمێ لە کوردستانی ئیران لە بەردەم هیزەکانی سولتان سەلیمی دوەمی عوسمانی دابەزین قۆناغی ململانێی هەمیشەیی نیوان هەردو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و سەفەوی و دەستی پیکرد. هەردولا پاش ئەم میژوە پەییان بەوە برد وەك ئارنۆلد تۆینبی بۆی چوە، کەروخانی یەکجارەکی‌ی یەکیکیان مەحالە. ئیتر مەسەلەکە پیویستی بەوە کرد کە دوژمن ئابلوقە بدرێ و دەست بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری‌دا بگیرێ. واتە، بە مانایەکی تر، ئەستەم بو ئەم ململانێیە لە ناوخۆی خودی ئیراندا یا لەناو خودی ئاسیای بچوکدا بمینیتەوە(1) چونکە ململانیکە کەوتبوە ناوچەکانی نیوان هەردو ئیمپراتۆریەتی دراوسێ، بە تایبەتی کە پتر لە 450 کیلۆمەتری سنوری نیوانیان بە خاکی کوردستاندا رەت دەبو، ئەم رێ و جییە کوردستانی کردە مەیدانیکی سەرەکی‌ی جێبەجێ کردنی ئەو ستراتیجە عەسکەری‌یە کە روخسارە جۆراوجۆرەکانی بە دریژایی‌ی چوار سەدە دەناسینەوە.

کوردستان ئەوسا سەرباری بایەخی شوینە ستراتیجی‌یەکەی، سەرچاوەیەکی ئابوری‌ی بە برشتی بۆ هەردو ئیمپراتۆریەتەکە پیکدەهینا. میرنشینەکانی ئەردەڵان و کرماشان و لورستان کە قەلەمرەوەکەیان زۆربەی ئەو ناوچانەیان نەدەگرتەوە کە ئەمرۆ بە بەشیکی کوردستانی ئیران دادەنرین، لە سەدەی نۆزدەهەمدا 37 هەزار تمەنیان باجی سالانە بە دەولەتی فارس دەدا، واتە بەرامبەر بە 14٪ی کۆی ئەو باجانە کە هەر شازدە یەکەکەی بەریوەبردن دەیانخستە نیو خەزینەی شاوە(2). ئامادێی یەکیك لە نوینەرانی سالانی 1804–1805ی ناپلیۆن لەلای دەولەتی عوسمانی کە سەری لە باکوری کوردستانیش داوە، سەبارەت بە لایەنەکەی دیکە گوتویە: ((لەشکرەکانی دەولەتی عوسمانی کە لە میسر شەری ناپلیۆن دەکەن، لەسەر گۆشتی ئەو ئاژەڵانە دەژین کە لە کوردستانەوە هینراون))(3). ژمارەی ئەوانەشی کە لی‌ی گەیشتونە ئەستەمبۆڵ، سالانە بە ملیۆن و نیویك سەر مەزەنە کردوە.

کوردستان نەك هەر لە نیوان ئەو دوو هیزەدا بەش کرابو، بەلکو هەر بەشیکیش کرابوە چەند میرنشینیکی دەرەبەگی‌و سەرەتای دامەزرانی هیندیکیان بۆ سەدەی دەیەمی زاینی دەچیتەوە. کامپانیل لە سەرەتای سەدەی یازدەهەمدا گرنگترین میرنشینەکانی ژماردوە: ئەردەڵان، کرماشان و لورستان لەژیر دەستی ئیمپراتۆریەتی فارسدا. بابان، بدلیس، سۆران، هەکاری، بادینان و بۆتان لە سایەی دەسەڵاتداری‌ی عوسمانی‌دا(4). ئەم میرنشینانە لەنیو خۆیاندا ناکۆکی‌یەکی نیمچە هەمیشەیی‌یان هەبو هەر یەکیکیان بنەمالەیەکی دەرەبەگ حوکمی دەکرد کە رۆلەکانی لەسەر دەسەڵات بە شەر دەهاتن و، هەردو دەسەڵاتداری‌ی ناوەندی‌ی عوسمانی‌و سەفەوریش شارەزایانە ئەم ناکۆکی‌یەیان بۆ ئەوە قۆستەوە کە هەم میرنشینەکانی پێ بیهیز بکەن و هەم ئەگەر ئارەزویان کرد سەربەخۆ بن یا بەلای ئمپیراتۆریەتەکەی دیکەدا دایبشکینن سەرکوتیان بکەن.

لیکۆلینەوەی میژووی کوردستان لە سەرەتای سەدەی پیشوودا چەند شەقلیکی سەرەکیمان بۆ دەخاتەروو کە باری سیاسی‌ی گشتی‌ی ئەودەمەیان پێ جوێ دەکریتەوەو، دەکریت لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەست نیشانیان بکەین:

- ناکۆکیی نیوان عوسمانی‌یەکان و سەفەوی‌یەکان و ئاسەواری خراپی لەسەر کورددا.
- پیکداهەلپژانی نیوان میرنشینەکان.
- خۆ ئامادەکردنی دەولەتی عوسمانی بۆ کۆنترۆڵ کردنی میرنشینەکان و خولیای سەربەخۆبوونیان.
- زۆرانبازی نیوان بنەماڵە کوردە حوکمدارەکان.
- زۆرانبازی نیوان دەسەڵاتی حوکمدارانی کوردو دانیشتوانی میرنشینەکان[5].



پێشتر هەوڵماندا چەند سەرنجێکی کورت لەسەر چوارچێوەی گشتیی باری سیاسیی کوردستان لە ماوەی پێش و لەکاتی سەرهەڵدانی ڕێبازی نەقشبەندیدا بەرچاو بخەین. ئەم سەرنجانە یاریدەی ئەوەمان دەدەن زۆر وردتر بڕوانینە بنیات و مێژووی یەکێك لەم میرنشینانە (بابان) کە زێدی لە دایکبوونی ڕێبازی نەقشبەندییە لە کوردستاندا[6].

## میرنشینی بابان

زانیاریمان لە بارەی سەرەتای پێکهاتنییەوە، ئەگەر هیچیش نەبێ، ئەوا یەکجار دەگمەنە. ئەوەی کە مێژوونووسان لەسەر مێژووی پێش سەدەی حەڤدە باسیان کردووە، پێویستی بە لێتوێژینەوەو بەدواداچوونی زیاترە. دیمەنی ئەم میرنشینە لە ساڵی 1686 بەدواوە پتر لە زەینماندا روون دەبێتەوە، ئەویش کاتێك فەقێ ئەحمەدی یەکێك لە سەرخێڵە نیشتەجێکانی ناوچەی پشدەر نازناوی ((بەبە)) یا ((بابە))ی لە سوڵتانی عوسمانییەوە پێ بەخشراو، پاداشتی دیکەشی درایە لەوانە پانتاییەکی بەرینی زەوی و زار، بەرانبەر بەو خزمەتەی کە بە عوسمانییەکانی گەیاند لە ململانێیاندا لەگەڵ سەفەوییەکاندا. میرنشینەکە لەم مێژووەوە هەڵکشانێکی بەردەوامی لە نەخشی سیاسی و عەسکەریی خۆیدا لە کوردستان یا عیراقی عەرەبیدا یان لە پەیوەندییدا لەگەڵ سەفەوی و عوسمانیاندا بەخۆوە دی. بێگومان ئەمەش گەلێك کارکردی هەبوو، لەوانە: شوێنی جیۆپۆڵەتیکیی[7] لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەکەدا کە توانای "لە سەر دوو پەت گەمە کردن"ی دایێ، بەربەرەکانێی میرنشینەکانی دیکە بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکەو، پەرەسەندنی خێرای ئابوری بەهۆی شوێنەکەیەوە کە دەکەوتە نێوان چەند ڕێگایەکی گرنگی بازرگانی و پەرەسەندنی کشتوکاڵ و ئاودێری و هی تر.

وێڕای نەخشی دیاری ڕێبازی ئاینی لە دیاریکردنی ڕەوتی بیرکردنەوەو هەڵوێستی سیاسیی دانیشتوانی ناوچەکەدا لە هەر چوار سەدەی ڕابردودا. سوننەکان لایەنگریی بابی عالی و شیعەکانیش لایەنگریی سەفەوی و پاشتر قاجارەکانیان دەکرد. بەڵام جێی سەرنجە کە ناکۆکی هەر لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمەوە کەوتە نێوان سەرانی بابان، لەو ڕووەوە کە بدەنە پاڵ کام ئیمپراتۆریەت. باڵی هەرە بەهێز لەنێو بنەماڵەی حوکمداری باباندا، لەبەر گەلێك هۆ کە ئێرە دەرفەتی باسکردنیان تێدا نابێتەوە، مەیلی بەلای سەفەوییەکانەوە بوو، ئەگەرچی خۆیان و دانیشتوی میرنشینەکەیان سەر بە مەزهەبیی سوننین. فارسەکان جاروبار دەورێکی عەسکەری و بە زۆریش سیاسییان لە دەستنیشان کردنی فەرمانڕەوای میرنشینەکەدا دەبینی. بەڵام زۆربەی جار پاش پاڵاوتنی میرە بابانیەکە لە لایەن والیی بەغداوە سوڵتانی تورك خۆی پاڵێوراوەکەی بە فەرمانڕەوا دادەنا. لەم بوارەشدا وا باو بوو کە نەیاری میر لە نێو بنەماڵەکەدا لە بەغدا گل بدرێتەوە تا هەڕەشەی پێ بکرێت و وا لە میر بکرێ سڵ لە هەموو تەقەلایەکی یاخی بوون بکاتەوە.

پەیوەندیی میرنشینی بابان بە میرنشینە کوردەکانی دیکەوە لە پەیوەندیی کەسێك دەچوو کە خۆی بۆ هەڵکوتانە سەر هاوسێکەی نابێتەوە: ساڵی 1787 لەشکرەکەی بابان میرنشینی ئامێدیی داگیر کرد[8]، ناکۆکیشی لەگەڵ میرنشینی سۆراندا تەنها لە ساڵی 1810دا خامۆشیی بەخۆوە بینی کاتێك یەکێ لە ئەندامانی بنەماڵەی دەسەڵاتدار ژنی لە بنەماڵە دەسەڵاتدارەکەی تر خواست[9]. هۆی ئەوەش کە بابانەکان شێوە زاری ئەردەڵانیان بە زمانی نیمچە ڕەسمی هەڵبژاردوە نەك شێوە زاری گۆران، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە بنەڕەتدا ویستویانە بەربەرەکانێی شێوەزاری گۆران بکەن.

پێشەواکانی بابان سەرەڕای پابەندبونی خێڵاتی نیشتەجێی نێو سنوری میرنشینی بابان بە ناردنی ژمارەیەکی دیاریکراو لە سوارو چەکدار بۆ مەیدانی ئەو شەڕانە کە میرنشین دەیکردن کەوتنە دروست کردنی لەشکرێکی تایبەت کە زۆربەی کات چەکی دروستکراوی خۆماڵیی پێ بوو. ئەم لەشکرە سەرەڕای ڕاهێنانی لەسەر بەرگریکردن لە میرنشین و بەرپەرچدانەوەی هەڕەشەو گوڕەشەی دەرەوە، لەوەش نەسەنگرایەوە کە بۆ بەجەهێنانی داوای عوسمانییان و بەدی هێنانی ئارەزوی خودی میرانی بابان هێندێك خێڵی کورد کە لە دەسەڵاتداریێتیی بابان یاخی بون یان هەندێ لەو خێڵە عەرەبانە سەرکوت بکات کە لە بابی عالی یاخی بون.

پەرەسەندنی ئابوری و سیاسیی میرنشین لە سەدەی هەژدەمدا وای لە میرانی بابان کرد بیر لە بنیاتنانی پێتەختێکی تازە بکەنەوە، چونکە پێتەختە کۆنەکە (قەڵاچوالان) چیدی بەکەڵك خواستەکانی هەلومەرجی تازە نەدەهات، لە کاتێکدا گرنگترین هۆی هەڵبژاردنی بە پێتەخت (واتە سەختیی ناوچەکەی و گونجانی بۆ پێشگرتن لە هێرشی بێگانە) لە کۆتاییی سەدەی هەژدەمەوە بو بە هۆیەکی سەرەکیی دەست لێ هەڵگرتنی، ئیبراهیم پاشای بابانی سەر بە عوسمانییان ناوچەی مەلیك هندی (مەڵکەندی)ی بە شوێنی پێتەختە تازەکەی دەست نیشان کرد، ساڵی 1770 دەستی بە بنیاتنانی کردو پاشتر بە چوار ساڵ لێی بووەوە. پێتەختە تازەکە بە "سلێمانی" یا "سولێمانی" ناودێر کرا، چونکە مۆرێکیان لە کاتی ئەرزهەڵکۆڵیندا دۆزییەوە ناوی "سلێمان"ی لەسەر نەخش کرابوو، بەڵام پاشای بابان بە سلێمان پاشای والیی ئەوسای بەغدای ڕاگەیاند کە شارەکە بەناوی ئەوەوە کراوە[10]. کاتێك کلۆدیۆس جیمس ریچ، نوێنەری کۆمپانیای هیندی خۆرهەڵات لە بەغدا، لە نەوەیەکی ئیبراهیم پاشای پرسی چی هانی باپیریدا ئەو ناوچەیە بۆ پێتەختەکەی هەڵبژێری، وەڵامی دایەوە: "چونکە حەزی لە ڕاوو شکار دەکرد، ئەو ناوچەیەش بۆ ئەوە دەست دەدات. سەرباری ئەوەی کە ئاوی زۆرە"[11]. بەڵام کامپانێل وای بۆ دەچێ کە هۆی هەڵبژاردنی ئەو شوێنە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بۆ بازرگانی دەسدەدا[12]. پێدەچێ کامپانێل لەم بارەیەوە باشی بۆ چوبێ بەتایبەتی کە بوژانەوەی بازرگانی لە شارەکەدا پاش ماوەیەکی کەم لە دامەزراندنی، پاڵپشتیی لێ دەکا.

دەزگا حکوومەتیەکانی بابان لە ساڵی 1784دا بۆ پێتەختە تازەکە گواسترانەوە. دەرگای شارەکە بۆ هەموو کەسێك خرایە سەر پشت و زۆربەی ئەو کرێکارانەشی تێدا نیشتەجێ بوو کە ئیشیان لە بنیاتنانیدا کردبو بێ لە کۆچ کردنی لە ڕادەبەدەری دانیشتوانی دێهاتە هاوسێ و دورەکانیش. ساڵی 1810 دانیشتوانی سلێمانی خۆی لە 15 هەزار کەس داوە، لەوانە 80 کەسیان جولەکەو 100 کەسیشیان دیان (مەسیحی) بون[13]. ساڵی 1820 شارەکە شەش خان، پێنج حەمامی گشتی، پێنج مزگەوت[14] و حەمامێکی تایبەت بە پاشای حوکمداری[15] لێ بو، وێڕای 2144 خانوو کە 130 یان هی جولەکە، 9 یان هی کلدان و 5 یشیان هی ئەرمەن بون[16]. شارەکە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بوە مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانی. گەڕیدەکان کاروانی ئاڵوگۆڕی بازرگانییان لەگەڵ شارەکانی دیکەدا بەم پێیەی خوارەوە باس کردووە:

- سلێمانی– بەغداو بە پێچەوانەوە.
- سلێمانی– کەرکوك و بە پێچەوانەوە.
- سلێمانی– موسڵ و بە پێچەوانەوە.
- سلێمانی– سنە– هەمەدان و بە پێچەوانەوە.



- سلێمانی- تەوریز و بە پێچەوانەوە.
- سلێمانی ئەرزرۆم و بە پێچەوانەوە.
- سلێمانی- میسرو بە پێچەوانەوە[17].

کاروانەکان بە باری گەنم، توتن، پەنیر، ترش، سابون هەنگوین، مازو، میوەهات، برنج، گوێز، ئاوریشمی سروشتی و قاوەوە لە سلێمانی دەردەچون و مەڕو ماڵاتیشیان لەگەڵ خۆدا دەبردو خورما، قاوە، قوماش، کەلوپەلی هندی، پێڵاو، پێستە، کاڵای دەستی‌ی دروستکراو، مس و ئاسنیان لەگەڵ خۆدا دەهێنا. بەغداش لە ڕێگای چەمی سیروانەوە داری لە میرنشینەکەوە دەبرد[18]. کاراونە بارزاگانی‌یەکان مانگی جارێك یا دوو جار دووپات دەبونەوە. بەڵام کاروانی روو لە میسر کردوو یان لەوێوە هاتوو بە دەگمەن ساڵی کاروانێك زیاتری دەکرد. کامپانێل سالبێ 1810 سەری لە سلێمانی داوەو، باسی ئەوەی کردوە کە بازرگانی لە میرنشینی باباندا لە چاو میرنشینە کوردیەکانی دیکەدا گەشەکردوترو ڕێکوپێك تر بووە. ئەمەش بە نۆرەی خۆی بۆتە هۆی پەرەسەندنی پیشەسازی دەستی لە شارەکەدا بە تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی‌ی بە کەرەستەی بیناکاری و چەك و چۆڵەوە هەبوە. چەکی لەشکری بابان (تۆپ، شمشێر، خەنجەرو هی تر) و تفاقی عەسکەری‌ی دیکە لە پاڵ چەکی سووکەڵەی خێلاتدا، لەو کارخانانە دروست دەکران کە بابانەکان بە

یارمەتی‌ی شارەزایانی رووس دایانمەزراندبوون[19].
مێژو ناوی چەندین سەنعاتکاری کوردی پاراستووە کە بە چەك دروستکردن ناوبانگیان دەرکردووە، وەك وەستا حسێنی چەخماخساز.
تێکڕای ئەم هەلومەرجانە بازاڕێکی تازەیان هێنایە گۆڕێ کە میرنشین پێشتر بە خۆوەی نەدیبوو و، ئەمەش بە نۆرەی خۆی بووە هۆی دەرکەوتنی توێژی کۆمەڵایەتی‌ی تازەی وەك بازرگان، سەنعاتکار، کارگەرانی بواری بیناکاری و خان و کاروانچێتی و بازرگانی (کە بە توێژی "بازاڕی" ناویان دەبەین). زۆربەی ئەوانەش بنەچەیەکی دێهاتی‌یان هەبوو و لەسەر دەستی ئەو زەویدارانە دەچەوسێنرانەوە کە دەسەڵاتدارێتی‌ی بابان پشتیوانی‌ی لێ دەکردرن. بەشی زۆری ئەم گروپە کۆمەڵایەتی-ئابووریە تازەیەش هێشتا بڕیاری نەدابوو لە شاردا بمێنێتەوە، بەڵکوو سەرگەردان و واق وڕماو لە نێوان دێهات و شاردا مابووەوە، ئەگەرچی بە ئاشکرا حەزی دەکرد لە شاردا نێشتەجێ ببێ. بۆیە پاشتر کە باری کۆمەڵایەتی-سیاسی‌ی شار تێکچوو، زۆریان زۆر بە نابەدڵی بۆ دێهات گەڕانەوە. ئەم گروپە هەر لە سەرەتای دروستبونیەوە لەگەڵ دەسەڵاتدارێتی‌ی بابان و ئەو دەرەبەگانەدا نەدەسازا کە لە شار نیشتەجێ بوو بوون و وەك چۆن دەستیان لەسەر پرۆسەی بەرهەم هێنانی لادێدا گرتبوو ئاواش دەیانویست بازاڕە تازەکە کۆنترۆڵ بکەن. ئەندامانی ئەو گروپە تازەیە نە تێڕوانینێکی سیاسی‌ی روونیان بۆ بارودۆخەکە هەبو نە ڕێکخستنێکیان هەبو لە سایەی‌دا کۆببنەوەو بەهۆیەوە بەرگری لە بەرژەوەندیە ناوکۆیی‌یە هەڕەشە لێکراوەکانیان بکەن. بۆیە سەیر نەبوو ئەو خەڵکە، با بۆ ماوەیەکیش بێ، لە دەوری تەریقەتی نەقشبەندی، لە سەرەتای سەردەرهێنانی‌یەوە لە سلێمانی لە ساڵی 1811دا، کۆببنەوەو بنکە کۆمەڵایەتی‌یە سەرەکی‌یەکەی پێکبێنن[20]. ئەم ڕێبازە بەرەیەکی لە هەموو ئەوانە پێکهێنا کە بەربەرەکانێ‌ی دەسەڵاتی سیاسی‌ی بابانەکان و دەسەڵاتی دینی-کۆمەڵایەتی‌ی ئەوسای تەریقەت و شێخانی قادری‌یان دەکرد.

## دامەزرێنەری ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا

مێژونوسان لەسەر مێژوی لە دایکبونی زیائوددینی خالد حوسێنی ناسراو بە مەولانا خالد نەقشبەندی‌ی دامەزرێنەری ڕێبازی نەقشبەندی لە کوردستان و وڵاتانی دیکەی موسڵمان پێك نەهاتون[21]. بەڵام پێیان وایە لە ماوەی نێوان 1776- 1779 لە دایك بوە. پێدەچێ ئەوەی لەم بارەیەوە شێخ محەمەد ئەسعەد ساحیب زادەی برازای یاداشتی کردوە (19ی کانونی دوەمی 1779)[22] لە هەمویان لە راستی‌یەوە نزیکەی بووبێ.

زیائوددین لە گوندی قەرەداغی نزیکەی 30 کیلۆمەترێك لە باشوری سلێمانی‌یەوە دوور، چاوی بە ژیاندا هەڵهێنا. گوندەکە سێ کانیاوی لێ بوو. حوکمداری بابان دوویانی داگیر کردبوو کەچی خەڵکی گوندەکە هەمویان ئاویان لە یەك کانیاو وەردەگرت. باوکی، چەردەیەك ڕۆشنبیری‌ی ئاینی‌ی هەبوو کە لە ساڵانی یەکەمی خوێندنی خالد سودیان پێ‌گەیاند. پاشان خالد

روی کردە خوێندنگـە ئاینی‌یـەکانی شـار. ئەمـە هـەموو زانیاری‌یەکـە لەسـەر هەڕەتی مێردمنداڵی‌ی خالد و هیچی زیاتر لەسـەر بنەماڵەکەی نازانین. بـەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیـە کە ئەو بنەماڵەیـە سـەر بـە توێـژی ئۆرۆسـتۆکراتی خێڵی جاف نەبوە.

خالد وەك ئەو دەمە لەلای قوتابیانی زانست لە کوردستاندا باو بوو، لە چواردە ساڵیدا شارەکەی بەجێ هێشت و بۆ فێربوونی زانستی ئیسلامی، بۆ لای مامۆستایانی ئەوسای کوردەواری سەفەری کرد. بۆ ئەم مەبەستە زۆر بە میرنشینی بابان و ئـەردەڵاندا گـەڕا. زانسـتی لەسـەر دەسـتی بڕێـك نـاوداری سەردەمەکەی وەرگرت و لە دەوروبەری ساڵی 1799دا هـەموو ئەو دەرسانەی تـەواو کرد کە خوێندکارانی بڕوانامـەی مەلایـەتی دەبـێ بیخوێنـن. بەدەسـت هێنانی ئەو بڕوانامەیـە لـەو تەمەنـەدا نیشـانەی ئـەو توانـا زەینی‌یـەی ئـەوە پاشتر چەندین ئەفسانەو حیکایەتی لەسەر کۆبونەوە. بە شـێوەیەك کـە هـی راستەقینەیان لە هی دەم هەڵبەست لێ جوێ ناکرێتەوە. هەر ئەو ساڵە پاشای بابان وەزیفەیەکی ئاینی‌ی لە سلێمانی‌دا خستە بەردەم بەڵام ئەم پێـی رازی نەبوو و رەتی کردەوەو لەم بارەیەوە چەند بڕو بیانویەکی هێنایەوە کە بە لای زوربـەی مێژونوسـان بـڕو بیـانوی راسـتەقینە نـین. لـە راسـتیدا خـالد ئـەو وەزیفەیەی بە کەم گرتبو، بە بەڵگەی ئەوەی کە ساڵی دوایی بە وەزیفەیەکی پایەبـەرزتر قـایل بـوو. ئـەم رووداوە ئـاڵۆزیی پێوەنـدی‌ی نێـوان مـەلا خـالدو دەسەڵاتی سیاسی‌ی میرنشین پیشان دەدات.

زۆربەی ئەوانەی لەسەر رەوشتی ژیانی‌یان نووسیوە، ئەو بەسەرهاتە



### وادەی جەژن

موسم عیداستو مانومید از دیدار یار
عالمی در عیشقو نوشو ما دو چشم اشکبار
هر کسی با یار درگشت گلستان استو من
زاشک سرخم شد کنار ازداغ هجران لاله زار
جان نثار مقدم جانان نکردە دم بدم
چیست بهره از تفرجهای تخت جان نثار
بی نواو دل پرازخارو غریب دردمند
دست بردل سربزانو چشم در ره دل فگار
سینه سوزان دل فروزان کوچه در بدر
کس مبادا همچو من اواره از یارو دیار
بکر جویی شد زهر چشمم روان ازخون دل
عاقبت کردم دواداغ فراق سرچنار
خالدا گرنیستی دیوانەو صحرا نورد
تو کجاو کابلو غزنینو خاك قندهار

### پیرەمێردیش ئاوا وەریگێڕاوە:

جەژنە من واناهومێدو بێ بەشی دیداری یار
خەڵکی خوڕڕەم من بە خوڕڕەم ئاو لە چاوم دێتە خوار
گشت لە کەشتی دەشتە داوین پڕ گوڵاڵەی ئاڵو، من
ئەشکی سوری داخی دووری دەوری کردمە لالە زار
بێ نەواو دڵ لەخەم کەیلو غەریبو بی نەصیب
دەست لە سەر دڵ سەر لە ئەژنۆ چاو لە ڕێگەی پرسیار
دڵسوتاوو جەرگ بڕاوو، کۆڵان بە کۆڵان دەر بەدەر
کەس بەدەردی من نەچێ، دور کەوتە یی یارو دیار
خوێنی دڵ وا هات بەچاوما بو بە جۆگەی ابەکرەجۆا
هەردو سەرچاوەی چەمێکن کردمە تاسەی سەرچنار
باوە مردەی باوەڕدەم ئاڵ بولاخی چاوەکەم
خۆزگە ئەمدی پێم بڵێن وا باوە گێڵدی گەییە شار
پێم بڵێ!! خالید ئەگەر تۆ وا ڕەهەندەو شێت نەبی
تۆ لە کویو کابولو غەزنەدینو وەڵاتی قەندەهار

دەگێڕنەوە کە لە گەڵ دەروێشێکی هیندیدا لێی رووداوە و ئەوە دەردەخات کە خالد بە پەرۆشەوە ویستویەتی دەستی بە شێخێکی سۆفی بگات تا رێی سۆفیەتیی بۆ روناک بکاتەوە، جا ڕیبازەکەی هەرچییەک بووبێ. خالد خۆیشی ئەم بەسەرهاتەی گێراوەتەوەو، وای لێکردووە بێ پسانەوە بیر لە سەفەری هیندستان بکاتەوە تا تەریقەتێکی سۆفیانە وەربگرێ. سەرنجراکێش ئەوەیە سەرەرای ئەوەی کە یەکێک لە گەورەترین شێخانی رێبازی قادری "واتە شێخ مارفی نودێ" لە شاری سلێمانیدا بووە، کەچی ئێمە شتێکمان نەخوێندووەتەوە لەسەر ئەوەی کە ئەم دوو کەسە چاویان بە یەکد کەوتبێ یا ئەوەی کە بە بیری مەلا خالد هاتبێ تەریقەت لەسەر دەستی ئەم شێخە وەربگرێ، لە کاتێکدا مەلا خالد پاشتر ئیجازەنامەی رێبازی قادریی لە شێخێکی هیندی وەرگرت. ئەم نموونەیە و گەلێکی دیکەش هەڵوێستی خراپی مەلا خالد دەرهەق بە دەسەڵاتی ئاینیی نێو پێتەخت ئاشکرا دەکەن.

مەلا خالد ساڵی 1808 بە وڵاتی فارسدا سەفەری بۆ هیندستان کردو بە توندی دوژمنایەتیی شیعەی کرد. بۆیە ئەوان دووجار هەوڵی کوشتنیان دا، بەڵام لە هەردوکیان رزگاری بوو. ساڵێکی رەبەقی لە دیلهیی هیندستان لەگەڵ شێخ عەبدوڵلای دیهلەویی رێبەری رێبازی نەقشبەندیی گوزەراند هەرچییەک پێوەندیی بەم قۆناغەی ژیانەوە هەبێ لێی بێ ئاگاین و خۆیشی یەکجار بە کەمی لێی دوواوە. ئەوەبوو بۆ کوردستان هاتەوەو فەرمانی شێخەکەی بەدەستەوە بوو تا لە وڵاتانی عوسمانیدا بانگهێشتن بۆ رێبازی نەقشبەندی بکات. بانگەوازەکەی بۆ یەکەمین جار لە شاری سنەوە، کە پێشتر لەوێ قوتابی بوو، دەست پێکرد. لەوێ شێخ محەمەد قەسیمی کوردستانیی مامۆستای پێشووی و کۆمەڵێک لە خەڵکی سنە هاتنە سەر رێبازەکەی. ساڵی 1811 گەیشتەوە سلێمانی و پێشوازییەکی گەرمی لێکرا. دەسبەجێ رووی کردە بەغداو مانگێ تێدا مایەوە. ئەو ماوەیە ژمارەیەکی زۆر لە زانایان و دانیشتوانی شارەکەو، هەروەها سەعید پاشای والیی بەغداو داود پاشای جێنشینی، هاتنە سەر تەریقەتەکەی. هەمان ساڵ بۆ سلێمانی گەرایەوە تا شێلگیرانە دەست بە بانگەواز بۆ تەریقەتەکەی بکات. بەڵام ئەو هەلومەرجە تازەیەی هاتە پێشێ، خستیە بەردەم ئەزموونێکی قورس کە بەسەرکەوتوویی لێی نەهاتە دەرێ.

### بڵاوبوونەوەی تەریقەت:

ساڵانی 1811-1820 بە پڕ بەرهەمترین رۆژانی ئەم رێبازە لە کوردستاندا دەژمێردرێن. ئەم رێبازە پشتیوانییەکی جەماوەریی مایەی سەرسامیی هەموو لێکۆڵیارێکی مێژووی ئەم وڵاتەی بەدەست هێنا، سەبارەت ئەوەی کە بەردەوام رووبەرووی دوژمنایەتیی قادرییەکان و ناوبەناو دوژمنایەتیی میرانی بابان دەبووەوە.

ژمارەیەکی زۆری خەڵک بە گەرانەوەی مەولانا لە ساڵی 1811دا بۆ سلێمانی هاتنە سەر رێبازەکەی. بەتایبەت ئەو توێژە بازارییەی کە هەلومەرجی پڕ شەڕوشۆڕی میرنشین زیانی لە بەرژەوەندییەکانیان دەدا. کە ئەوان بێ پەردە دوژمنایەتیی ئەو دەرەبەگانەیان دەکرد کە ئەوکاتە لە دەوری هەردوو هێزی سیاسی و ئاینی- کۆمەڵایەتیی پێتەختدا خڕ بووبوونەوەو ئەوەیان لە سەرەتای سەدەی رابردووشدا بە شێوەی هەمەجۆر و لە بۆنەی جیاوازدا خستبوە روو(23).

بۆیە رێبازە تازەکە چوارچێوەیەکی وای بۆ ئەوان پێکهێنا کە گوزارشتی لە بەرژەوەندیی هاوبەشیان کرد. لەبەرئەوە لە سەرەتاوە بە توندی پشتگیرییان کرد. ئەمجا خەڵک بە کۆمەڵ هاتنە سەر تەریقەتەکە. لە کاتێکدا بڵاوبوونەوەشی بە تەنێ لە کوردستاندا نەگیرسیاوە، بەڵکو خەلیفەکانی مەولانا بە تورکیا، سوریا، فەلەستین، عیراق، داغستان و چەند ناوچەیەکی دیکەدا وەربوون. ژمارەی خەلیفە کوردەکانی، خۆی لە 34 خەلیفەو هی بێگانەکانیشی خۆی لە 33 خەلیفە دەدا(24). بە قسەی ریچ ساڵی 1820 دوازدە هەزار مورید لە وڵاتانی عەرەب و تورکیا سەر بە تەریقەتەکەی لە هەموو وڵاتاندا بە بیست هەزار کەس داناوە(26).

ئەمە ژمارەیەکی گەورەیە ئەگەر لەگەڵ ژمارەی موریدانی ئەو رێبازە سۆفیەتیانەی دیکەدا بەراورد بکەین کە چەندین سەدە لە وڵاتە موسڵمانەکاندا هەڵیان کردبوو. ئەو موریدانەش کە رێ و رەسمی زیکرو خواپەرستییان بە پێی رێبازی نەقشبەندی بەجێ نەدەهێنا بەڵام وا خۆیان دەردەخست کە سەر بە رێبازەکەو شێخەکەین، دەخرێنە پاڵ ئەوانە کە ئەو رێو رەسمەیان بیجێ دەهێنا. ژمارەی ئەوانیش-وەک دەردەکەوێ- کەم نەبوو.

دەستڕۆیی مەولانا لەنێو کورددا گەیشتە ئاستێک کە بە عەبدولقادری گەیلانییان دەچواند و قسەکانیان بە فەرموودەی پێغەمبەرانە یا بە خاوەن سەرچاوەیەکی خواوەندانە دادەنا. میرانی بابانیش کە ماوەیەک هەوڵیاندا دەستەمۆی بکەن، ئەم دادەنیشت و ئەوانیش لە بەردەمیدا رادەوەستان تا قلیانەکەی تێ بکەن. مەسەلەکە وای لێهات مەولانا خالد بڕوانێتە ئەو گیروگرفتە سیاسیانەش کە لەنێو ئەندامی بنەماڵەی حوکمداری میرنشیندا دەقەومان. ساڵی 1816 مەحموود پاشای میری بابان مزگەوتێکی بۆ دروست کرد کە تا ئەمڕۆ بەناوی خانەقای مەولاناوە ناسراوە.

شێوازی رێکخستنی رێبازی نەقشبەندی لە هی رێبازی قادری بەهێزترو باشتر بوو. بە مەرج نەبوایە کەسی تێدا وەرنەدەگیرا. بەرزبوونەوەش لە پلە هەرەمیەکاندا بە نسیبی هەموو موریدێک نەدەبوو، ئەو مەرجەش کە پێویست بوو لە موریدا هەبێ بۆ گەیشتنی بە پلەی خەلیفە سەخت و دژوار بوو، بە رەزامەندیی خودی مەلاونا خالد نەبوایە نەدەبوو. موریدی پێشکەوتوو رێبەریی موریدی دەست پێکردووی دەکردو ئەمانەیش خەلیفەیەک لە زیکرکردندا رێبەریی دەکردن. زیکر حەفتەی دوو جار دەکرا. دەبوو موریدان لەبەر دووریان لە کەس و کاریان پیکەوە بژین و، تیکەلی ئەوانە نەبن کە دژایەتیی ریبازەکە دەکەن. مەولانا ریبازەکەی لە دەرەوەی شاردا بە پێی دابەشبوونی خیلەکان ریکخست. خەلیفەی خۆی لەلای خیلەکان هەبوو کە نوینەرایەتییان دەکردو بەناوی ئەوەوە دەئاخاوتن. بەڵام ریکخستن لە شاران و دەرەوەی کوردستاندا شاری بوو و ریکخستنی خیلەکیانەی نەکردبوو بە بنچینە. ئەگەر خەلیفەیەکیش لە فەرمانەکانی تیبپەراندبایە. لە مەلبەندی گشتییەوە (سلیمانی) وریا دەکرایەوە یا ئینزاری بۆ دەردەچوو و بەسەر هەموو نەقشبەندییەکاندا دەبەخشرایەوە. ئەگەر کارەکەی دووپات ببوایەتەوە، ئەوا لە تەریقەتەکە دەردەکرا. ئەمە دەقاودەق لە خەلیفەی مەولانا لە ئەستەمبووڵ و وڵاتانی پشت رووباری جیحۆن و سیحۆن قەوما. ناوەندیتیی دەسەڵات یەکیک بوو لە گەورەترین ئامانجەکانی مەولانا کە تا کۆچی دوایی لە 1827 توانی بیپاریزێ. ناوەندەکانی هیزو بالەکان لە ریبازەکەدا لەم میژووە بەدواوە بەرەبەرە بەرجەستە دەبوون.

ئەوەی هەولی دابێ لیکدانەوەیەکی زانستی بۆ بلاوبوونەوەی خیرای ریبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا بەرچاو بخات مارتن ڤان بروونەسنە کە هۆیەکەی داوەتە پاڵ جیاوازیی لە ریبازی قادری و بارودۆخی کۆمەڵایەتی - سیاسییی کوردستان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا. ناوبراو سەبارەت بە خالی یەکەم لەوە دواوە کە لایەنی گیانی لە کن نەقشبەندیەکان لەچاو قادرییەکاندا رەسەنترەو ریبازەکە لە تۆکمەیی و ریکخستندا ئەو وردەکارییەی تیدایە کە ریبازی قادری لێ بیبەشە. پەیوەندیی هەرەمیی ریبازی نەقشبەندیش لە هی قادرییەکان توندوتۆلتر(275). سەبارەت بە هۆی دووەمیشیان وای بۆ چووە کە: "کوردستان لە قۆناغی راپەرینی دژ بە

عوسمانیەکان دەژیاو گوشاری بەرژەوەندی‌یە ئیمپریالیستیەکان ملی بۆ ناوچەکە دەنا. بۆیە شتیکی سروشتی بوو کە ریبازیکی وا برەو بسەنێ کە شیخەکانی دژایەتی‌ی ئاینی مەسیحی و بیگانە دەکەن"(28). بەلگە لەسەر ناحەزی‌ی شیخانی نەقشبەندی لە عوسمانیەکان زۆرن. خیلەکانیش لەبەر ئەوە هاتنە سەر ئەم تەریقەتە چونکە دەسەلاّت و پەیوەندی‌ی کۆمەلاّیەتی و ئابووری‌یان لە لایەن بابی عالی‌یەوە تووشی مەترسی بووبوو، تەنانەت سولتان خۆیشی وتبوی کە لە "خولیاکان"ی شیخ خالد دەترسێ کە گوایە دەشێ "ئینگلیز پالپشتی ئەو بن". ئەوەی کە یەکێ لە هۆکانی سەرکەوتنی بزوتنەوەکە دژایەتی کردنی مەسیحیەت و بیگانە بن پێ ناچێ لیکدانەوەیەکی راست بێ چونکە ئەو ناوچەیەی ریبازی نەقشبەندی‌ی تیدا بلاّوبۆوە هیشتا بەر شالاّوی مژدەبەرە مەسیحی‌یەکان نەکەوتبوو. بۆ نمونە، سلیمانی هیچ کەنیسەیەکی لی نەبوو ژمارەی جولەکەکانیش زۆر لە ژمارەی مەسیحی‌یان زۆرتر بوو. بێ لەوە، بزوتنەوەکە بەرهەلستکارانی حکومەتی بابان و شیخانی قادری و بەرهەلستکارانی حوکمی عوسمانیشی گرتبوە خۆ. "ریچ" لە کتیبەکەیدا دلبەندی‌یەکی ئاشکرای دەرهەق بە مەولانا نیشان داوە کە پەیوەندی‌ی بە کۆمپانیای هیندی خۆرهەلاّتەوە هەیە. کەواتە چۆن دەکرێ بوترێ گوایە بزوتنەوەکە دژی مەسیحی‌یەکان و بیگانە بوە؟ ئەگەر مەبەست لە بیگانە عوسمانی‌یەکان بێ، ئەمە مەسەلەیەکی راستە. بەلاّم نوسەر لەو مەبەستە ترازاوەو، ئیمەش هەم بە پیی ئەو بەلگانەی باسمان کرد و هەم بە پیی بەسەرهاتەکانی لەوە بەدوای ریبازی نەقشبەندی، ئەستەمە بە بۆچوونی وا قایل ببین.

هۆی ئەم سەرکەوتنە گەورەیە –بەرای ئیمە– ویرای ئەو هۆیانە کە تییاندا لەگەلّ مارتن ڤان بوونەسندا هاودەنگین، بۆ چەند فاکتەریك دەگەریتەوە:

1–بارودۆخی سیاسی–کۆمەلاّیەتی‌ی ئەوسای سلیمانی، واتە ململانی‌ی تویژە بازاری‌یەکان لەگەلّ دەسەلاّتی سیاسی و ئاینی–کۆمەلاّیەتی‌ی باودا.

2–پیویستی‌ی چەند خیلیك بە خۆکۆکردنەوە بۆ بەرگریکردن لە ریکخستنە هەرەشە لیکراوەکانیان، لە سۆنگەی ئەمەوە بە پەیوەندی‌ی تەریقەتی –سۆفیتی (ئەگەر لە دارشتنی ئەم زاراوەیەدا بە هەلەدا نەچووبین) باسکی پەیوەندی‌یە خیلەکی‌یەکانیان ئەستورتر کرد.

3–باری دەروونی‌ی نالەبار کە خەلکی کوردستان بە تایبەت و هی ولاّتانی عوسمانی بە گشتی بەهۆی شەروشۆری بەردەوامی ناوەکی و دەرکیەوە تییدا دەژیان، چونکە ریبازی نەقشبەندی لە زیکرو کەشە نیوخۆییە داخراوەکەیدا ئارامیکی دەروونی و زەینی‌ی وای بە مریدەکانی بەخشی کە واقیعەکە لییان بیبەری بوو.

4–کەسایەتی‌ی بەهیزی شیخی تەریقەت. بەرهەلستی‌یەکی "دینی" کە دوچاری ریبازی نەقشبەندی بوو، هۆیەکی یارمەتیدەر بوو بۆ پەرەسەندنی ناوبانگ و جەماوەریتی‌ی تەریقەتەکە، بە تایبەتی لە کوردستان و عیراقدا.

## ململانیی نیوان هەردوو ریباز

بیگومان ئەو پیشهاتە تازەیە بە زۆری هەرەشەی لە دەسەلاتی ریبازە کۆنەکە –قادری– دەکرد، ئەو هیزە ئاینیەی لە میرنشینی بابان و هەموو کوردستاندا بەربەرەکانێ نەدەکرا. دەبێ لیرەدا چەند قسەیەکی پەلە لەسەر ریبازی قادری بکەین.

رەگ و ریشەی ریبازی قادری بۆ سەدەی سیازدەهەم دەگەریتەوە، وەختیك شیخ عەبدولعەزیزی کوری شیخ عەبدولقادری گەیلانی (1077–1166) لە کوردستاندا دەستی بە بلاّوکردنەوەی ریبازەکە کرد. ئەو ریبازە لە ماوەی چەند سەدەیەکدا بوە گەورەترین ریباز لەنیو کورددا.

سلیمانی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا یەکیك لە مەلبەندە سەرەکیەکانی ریبازی قادری بوو، چونکە شیخ مارفی نۆدێیی لە باوکەوە شیخایەتی‌ی قادری و پیشنویژی‌ی گەورەترین مزگەوتی میرنشینی بابان و سەرۆکایەتی‌ی خیلی بەرزنجەی بە میرات بۆ بەجێ مابوو. شیخ مارف تا پەیدابوونی ریبازی نەقشبەندی بالاّدەسترین سەرچاوەی ئاینی‌ی پشت پێ بەستراوی میرنشین بوو.



کەواتە ئاسایی بو شیخ مارف دوژمنایەتی‌ی شیخی ریبازی نەقشبەندی بکات و بەوەش یەکلایی‌ی بکاتەوە کە شیخی نەقشبەندی لە سلیمانی هەلبیت و چیدی بەربەرەکانێ‌ی دەسەڵاتەکەی لە شاردا نەکات. شیخ مارف هەر لە سالی (1811) بەدواوە لەگەڵ دەست و پیوەندانی ریبازەکەیداو بە پشتیوانی‌ی حکومەتی عەبدولرەحمان پاشای بابان واتەواتی وایان بەنیو خەلکدا بڵاوکردەوە کە مەولانا خالدیان بەکفرکردن تاوانبار دەکردو لاف و گەزافی ولایەتی هەرە گەورەو پەردەپۆشکردنی ئامانجی سیاسی‌یان بە روخساری ئاینی دەدایە پاڵ. کاتیک چەوسانەوەی راستەوخۆ لە لایەن پاشاوە مەولانای هەلپیچا لە سلیمانی هەلبیت و هەمان ساڵ پەنا بەر بەغدا ببات، شیخ مارف نامەیەکی بۆ والی‌ی بەغدا نارد ناوی "تحرير الخطاب في الرد على خالد الكذاب"ی لیناو داوای ئەوەی تیدا کرد کە: "خالدی درۆزنی کافر ریسوا بکریت و لە بەغدا وەدەر بنریت". بیگومان ئەم داوایەی رەت کرایەوە. پاشتر هەر خۆی نامەکەی فەوتاندو ئیستا هەر چەند پارچەیەکی لی ماوەتەوە. سالی 1813، پاش مردنی پاشا، کاتیک مەولانا بۆ سلیمانی گەرایەوە، ململانێ‌ی نیوان هەردوو ریبازەکە لەناو شاردا رەنگی ناکۆکی‌یەکی رۆژانەی گرت. تاکتیکی شیخ مارف ئەوەبوو کە هەموو لایەنگرانی لەگەڵ خۆیدا سازو تەیار بکات و هەولیش بدات ململانیکە بخاتە بەردەم دەولەتی عوسمانی‌یەوەو لەنیو کوردەواریدا نەهیلتەوە.

بۆیە شیخ مارف هانی عوسمان جەلیل مەوسلی‌ی‌دا کتیبی "دين الله الغالب على كل منكر مبتدع كاذب" دابنیت کە مەبەستی مەولانا خالد بوو. محەمەد ئەمین سویدی‌ی موفتی‌ی عیراقیش بە داواکاری‌ی والی‌ی بەغدا (نەک مەولانا خالد) بە کتیبیک بەرپەرچی دایەوە ناوی "السهم الصائب في من سمى الصالح بالمبتدع الكاذب" بوو. مەولانا بە هەمان شیوە بەرەنگاری ئەم تاکتیکە نەبوەوە، بەلکوو بە پیچەوانەوە، تیکۆشا رێ لە دڵ گەرمی هەندیک لەو لایەنگرانەی بگرێ کە دەیانویست بە هەمان شیوە بەرپەرچی زەبرلیدانەکە بدەنەوە.

ژمارەیەکی دیکەی کتیب و نامە بۆ داکۆکیکردن لە مەولانا یان دژی نووسراون. ئەو دەستنووسانەش کە توانیومانە لە بارەی ئەم ململانێیەوە بیانخوینینەوە. لە زۆربەیاندا تیبینمان کردووە بنووسەکەی یا ویستویەتی مەولانا بە کافر لە قەلەم بدات یا تەمی کافری‌ی لە دەور برەوینیتەوەو ئاینی پاک و بیگەردی بداتە پاڵ ئەو دوژمنایەتی‌یەش کە یەخەگیری بوە بە چاوچنۆکی‌ی شەخسی لیک بداتەوە. کەسیک کە بە شوین زانیاری‌ی سۆسیۆلۆژی یا میژوویی بەکەلکی نیو ئەم نوسینانەدا بگەرێ، بەداخەوە بە دەستیکی بەتاڵ دیتە دەرێ بەڵام هەندێ وردە سەرنجیشی دەسدەکەوێ کە رەنگە بۆ تیگەیشتنی گشتی‌ی ناکۆکی‌یەکە سودی پێ ببەخشن.

کاتیک شیخ مارف پەی بە سەرنەگرتنی هەموو ئەو هەوڵانە برد کە بۆ تەکاندنەوەی خەلک لە ریبازە تازەکە دابووی، پەنای بۆ ریگایەکی دیکە برد. نامەیەکی بۆ یەحیای مزوری‌ی یەکیک لە شیخە کوردە بەناوبانگەکان ناردو داوای لی کرد فریای بکەوێ تا لە دەست مەولانا قوتار ببێ. ئەمە دەقی نامەیەکە کە زۆر بەلگەی تیدا هەن:

"لە تیکرای زانایانی سلیمانی‌یەوە بۆ هەرە زانای سەرلەبەری دنیاو ئاین حوججەتولموسلیمینی مەولاو شیخمان شیخ یەحیای مزووری، خوای گەورە موسلمانانی بە تەمەن دریژی ئەو بەهرەمەند کرد.

### پاش سڵاو

خالدمان لە نیودا قوت بوەتەوە کە پاش هاتنەوەی لە هیندستانەوە بۆ ئەم وڵاتە لافی ویلایەتی هەرە گەورەو ئیرشاد لیدەدات. ئەو کابرایە پیاویکی وایە کە پاش بەدەست هینانی زانست وازی لی هیناو ریی سەرلیشیواوی هەلبژارد ئیمەش نەمانتوانیوە سەری پێ دانەوینین و دەمکوتی بکەین. بۆیە دەبێ بینە لامان تا دەمکوتی بکەن و سەرلیشیواوی و نیازەکانی دوور بخەنەوە. ئەگینا گومرایی، موسلمانان دەگریتەوەو بە وڵاتدا دەتەنیتەوە. سڵاو و رەحمەت و بەرەکەتی خواتان لی بێ"(29).

ئەم نامەیە دان بە توانای زانستی‌ی ئیسلامی‌ی مەولانادا دەنیت و، زۆری‌ی شوینکەوتوانی و بیدەسەڵاتی‌ی قادری‌یەکان هانا بۆ ئەو کەسە دەبەن کە لەوان بەتواناترە ئەوە بکات. کە شیخ یەحیای مزووری بۆ پاشەکشەکردن بە مەولانا گەیشتەجێ، دەم و دەست چوو چاوی پێ بکەوێ: دیدارەکە چەندین سەعات دریژەی کیشاو شاریش چاوەروانی ئەنجامی دەکرد. هەموو شار دوای ئەم دیدارە زانیان شیخ یەحیا چووەتە سەر تەریقەتی نەقشبەندی و شیخ یەحیا مەولانای، سەرباری کەم تەمەنی، بە شیخی خۆی قبوڵ کردووە. بنووسان گەلیک ئەفسانە لە بارەی ئەم دیدارەوە دەگیرنەوە پیمان وایە گۆرانی هەلویستی شیخ یەحیا بۆ دوو هۆ دەگەریتەوە:

1–کەسایەتی‌ی مەولاناو تیگەیشتوویی‌ی لە رادەبەدەری کە مایەی سەرسام بوونی شیخ یەحیا بوو.

2–بۆی دەرکەوت ناوەرۆکی نامەکەی شیخ مارف لەگەل واقیعدا جووت نایەتەوە.

قادری‌یەکان پاش ئەم رووداوە بریاری کوشتنی مەولانایان دا. داویکیان بۆ خافلکوژکردنی نایەوە. بریار بوو دوو سەد کەس لە لایەنگرانی شیخ مارفی نۆدێیی‌ی تیدا بەشدار بێ کە زۆربەیان لە دیهاتی دەوری شارەوە هینرابوون. ئەو کۆمەلە کەسە کە بۆ راپەراندنی ئەم ئیشە ئامادە کرابون، کاتیک مەولانایان بینی ورەیان بەرداو پەرەوازە بوون. ئەمە پوختەی بەسەرهاتی پیلانەکەیە کە نووسەرە لایەنگرەکان شیخی نەقشبەندی‌یەکان دەیگیرنەوەو زیدەرۆیی‌یەکی زۆری پیوە دەکەن. ئیتر شیخ مارف لەوە بەدوا کاک ئەحمەدی شیخی کوری و عەبدولرەحمان تالەبانی‌ی خەلیفەی بۆ کوشتنی نارد. بەڵام هەردوکیان ئیشەکەیان بۆ جێبەجی نەکرا. بۆ جاری دووەم ناردنیەوە، کەچی بەختی لە جاری یەکەم یارتر نەبوو(30).

تۆ بلیی چی نیوەنیوی شیخ مارفی دابێ وەها بمینیتەوە، بەبێ ئەوەی تەنانەت بۆ جاریکیش چاوی بە مەولانا بکەوێ؟ بیگومان هاندەری شەخسی لە ئارادا بوون. شیخ مارفی ملکخیوی زەوی و زاریکی بەرین و سەرۆکی خیلیکی گەورەو شیخی گەورەترین تەریقەت لە کوردستاندا ئەوەی بۆ قووت نەدەچوو یەکیکی لە خیزانیکی بێ داروبارەوە داکەوتوو لە دەسەڵاتە ئاینی–کۆمەڵایەتی‌یەکەیدا بەربەرەکانێ‌ی بکات. چۆن بەوە قایل دەبوو تەریقەتەکەی لە ماوەی چەند سالیکی کەمدا ببەزینریت. بێ لەوە تاقمیک لەو دەرەبەگانە دەوریان دابوو کە سلیان لە دوژمنە بازاری‌یەکانی چواردەوری مەولانا دەکردەوە. هاندەری راستەقینەی هەلویستیان ئەوە بوو لە رەوینەوەی دەسەڵاتی خۆیان دەترسان، نەک لە پوکانەوەی ئاینی ئیسلام وەک لافیان لیدەدا. خودی شیخ مارف ئەمەی سەلماند، وەختیک داوای لە مەولانا کرد لە کردەوەی پیشووی خۆش ببێ، ئەویش دوای ئەوەی مەولانا لە سالی 1820دا بۆ دووەم و دوایەمین جار لە سلیمانی هەڵات، ئیدی هیچ دەسەڵاتیکی راستەقینەی لە شاردا نەماو دەسەڵاتی قادری‌یەکانیش بەسەر شاردا لە جاران بەهیزتر بوو. مەولانا لە هەلویستەکانی شیخ مارف خۆش بوو، کردەوەکانی بە کردەوەی نەزانان دایە قەلەم کە بە رای ئەو لە زانای ئاین ناوەشینەوە(31).

### هەلویستی بابانەکان

حوکمدارانی بابان هەر تەماشاکەری ئەو ململانێیەی نیو پیتەخت نەبوون، بەلکوو پیرەوی سیاسەتیکیان کرد کە ئەگەر لە هەلویستی جۆربەجۆری سالانی 1811–1820 و لەوە بەدوایان ورد ببینەوە دەتوانین هیلە گشتیەکانی

بناسـینەوە. دوو مـیر لـەو قۆناخـەدا حوکمـداریی میرنشـینیان کـرد: عەبدولرەحمان پاشاو مەحموود پاشایی کوری. سیاسەتی یەکەمیان مەودای بە پەلهاویشتنی هیچ بزووتنەوەیـەکی کۆمەڵایـەتی یـا ئـاینی لـە میرنشـیندا نەدەدا، ئەگەر ملکەچی دەسەڵاتی خۆی نەبوایە. بۆیە مەولانا پاش هاتنەوەی لە بەغدا لە سالی 1811دا، نەیتوانی لە چەند مانگێ بەولاوە لـە سـلیمانی بمینیتـەوە، چونکە کاتیك عـەبدولرەحمان پاشـا هەسـتی کـرد بـۆ یـەکبوونی میرنشـین جیـی مەترسـی‌یە، ناچـاری کـرد بـەجیی بـهیلێ. بـێ لـەوە کەوتـە چەوساندنەوەی دەست و پیوەندەکانیشی لە شـاردا، وەك ئـەوەی لـە نامـەی نیردراوی مـەولانادا بـۆ هیندیك لـەو بابانیانە کـە پیوەنـدیی دۆسـتایەتی‌یان لەگەلدا نـەبریبوون دەردەکـەوێ. لـە کاتیکدا سیاسـەتی کورەکـەی بـەوە جـوێ دەکریتـەوە کە هـەولی داوە بـە نـەرم و نیانی‌یـەکی زیـاترو دیپلۆماسـیەتیکی زیرەکانـەترەوە شیخی تەریقەتەکەو پاشتر شوینکەوتوانی بخاتـە ژیر رکیفـی خۆی. مەحمود پاشا هەر کە هاتە سەر تەختی حوکمداری، سەفەری بۆ بـەغدا کرد تا پەیوەندیی لەگەلدا دابمەزرینیتەوە چونکە ئەو پەیوەندی‌یە لە ئاخرو ئۆخریی حوکمداریی باوکیدا پچرابوو. لەم سەفەرەدا دەستوداوینی مـەولانا بـوو تـا بـۆ سـلیمانی بگەریتـەوە، ئـەویش رازی بـوو. پاشـا چـەند پارچـە زەوی‌یـەکی کشتوکالی و ژمارەیـەك باخی بـۆ خـەرجیی قوتابیـان و موریـدان، کرد بە وەقفی ئەو مزگەوتەی بۆ مەولانای بنیات نا. ئەم سیاسـەتە تارادەیـەك سەری گرت چونکە گەلیك لە لایـەنگرانی مـەولانا کە دوژمنایـەتیی پاشاکانی بابانیان دەکرد، لیی تەکینـەوە. سیاسـەتی مـەحموود پاشا دوولانـە بـوو: لـە لایەکەوە بە ئاشکرا تیدەکۆشـا بـە هـەموو ریگایـەکی شـیاوی وەك سـامان و پلەوپایەو سەلماندنی ئازادیی کارکردن نەقشبەندی‌یەکان دەستەمۆ بکات و لە لایەکی دیکەشەوە ژیر بە ژیر دوژمنەکانی تیژ دەکردنەوە تا بەربـەرەکانیێ بکـەن و. لـە ئاسـتی هـەولی خـافلکوژکردنی نەقشبەندیەکانیشـدا قروقـەپی لی دەکرد پاشتر ئەمە دنەی مەولانای دا لەسەر ئەوە گلەیی لە پاشا بکات.

بۆچوونی باوی ناو حکوومەتی بابان مـەولانای بە پیاوی عوسمانی‌یەکان دادەنا. کەواتـە ئـەو بـۆ میرنشـین جیـی مەترسـی‌یە. پـەیوەندیی بابانـەکان بـە عوسمانیەکانـەوە بەسـەر نەقشـبەندیەکاندا شـکایەوە. ئـەو دوو جـارەی مـەولانایان تیدا شاربەدەر کـرد، پـەیوەندی‌یان بـە عوسمانی‌یەکانـەوە شـلۆق بوو. کاتیك لە 1813 و 1822 دا داوایان لە مەولانا کرد بۆ شارەکەی بیتـەوە، ئەم پەیوەندی‌یانە روو لـە باشـی بـوون. دەتوانـین نامەکـەی مـەولانا بـۆ والیی بەغدا بکەینە بەلگەیەك لەسەر ئەو ریزو حورمەتەی کە لە هەندێ قۆناغدا لەنیو بابانەکان دا هەیبوەو بەهۆیەوە یەکێ لەو فاکتەرانەش بزانین کە وایان کردوە بابانـەکان گومـان لـە عوسمانچیتی‌یەکـەی بکـەن: ".. مـەحمود پاشـای مـیری میرانی بابان و عەبدوللا پاشای مامی و عوسمان بەگی برای و قازی و زۆربـەی دەسـوپیوەندو پیاوماقولـەکانیانمان داوەت کـرد. پاشـان یـەك لـە دوای یـەك قسەمان لە گەلیاندا کرد. بە پشتیوانیی خوای گەورە دڵ و دەرونیان پر لە وەعزو گیرفان و قۆلـی جلـەکانیان لـە گەوهـەری لـەبز، تا لـە دواییدا ملیان ناو گویرایـەڵ بوون، ئـەوەیان لـەخۆ دامالی کـە بـە دریژایـیی سـاڵان لـە ناخیـان پەنگی خواردبۆوەو لە ئاکامدا پاشگەز بونەوە. ئینجا کۆریکمان بۆ بەستن و ئەوپـەری توندوتیژیمـان لەگـەلدا نوانـدن، ریگـای فروفیلمـان لی گرتـن و هەرەشەشمان لی کردن، هەولماندا مەحمود پاشا مەحکەم سویند بدەین و لـەم بارەیەوە بـەلین و پـەیمانی راسـت و دروسـتمان لی وەرگرتـن.."(32) بـەلین و پەیمان سەبارەت بە پەیوەندی نەکردن بە فارسەکانەوە.

هەموو کۆششی بابانەکان بۆ کۆنترۆڵ کردنی بزوتنەوەکە سەری نـەگرت، شـتیکی پیچەوانـەی ئەمـە مومکـین نـەبوو بیتـە دی، چونکـە زۆربـەی نەقشبەندی‌یەکان لەوانە مەولانا دژایەتیی حوکمی بابانەکانیان دەکرد. کاتیك پـەیوەندیی نیـوان بابانـەکان و عوسمانی‌یـەکان رووی لـە سـاردی کـردو ململانێی قادری– نەقشبەندی ئەوەندە توندوتیژ بوو کە دەبوایە پاشای بابان هەلویسـت لـە مەسـەلەی نەقشـبەندی‌یەکان وەرگـرێ، ملـی نـاو هەلویسـتی وەرنەگرت. کلۆدیۆس جیمس ریچ کە رۆژی 20ی تشرینی یەکـەمی 1820 لـە سلیمانی بووە، ئەمەی نووسیوە:

"ئەم بەیانی‌یە شیخ خالدی گەورە هەڵات و سەرباری ناخافلی و نهینبریی هەڵاتنەکەی، هەر چوار ژنەکەشـی لەگـەڵ خۆیدا بـرد. هیشـتا نازانین رووی لـە کوێ کـردووە، چـەند رۆژیك لەمەوبـەر کوردەکـان بە کەسیکی لـە عـەبدولقادر (مەبەستی شیخ عـەبدولقادر گەیلانی‌یـە) پایەبـەرزتریان دادەنـا. پاشا عـادەتی وابوو لە کاتیکدا کە ئەم دادەنیشت، ئەو لە بەردەمیدا رادەوەستاو قلیانەکـەی بۆ تیدەکرد. کەچی ئەمرۆ پیی دەلین کافرو گەلیك قسـەو قسـەلۆك لەسـەر رۆح زلی و خراپـەکاریی دەگیرنـەوە، باسـی ئـەوەش دەکـەن چۆن بـە مردنـی کـوری پاشا دەسەڵاتەکەی لە دەست دا چونکە لافی ئەوەی لیدەدا کە گوایـە دەتوانێ لە مردن رزگاری بکات"(33).

هـۆی هەڵاتنەکـەی بـە چـەندین شیوەی جۆراوجۆر باس دەکریـت. هیندیـك دەلین ئاژاوەی لەنیو پاشاو براکانیدا نایـەوەو، پاشاش ویسـتی رووبـەروویان بکاتـەوە. هیندیکیش بـۆ ئـەوە دەچـن کـە مـەولانا بناغـەی ریبـازیکی ئـاینیی تـازەی دادەنـاو دەیویسـت خـۆی بکاتـە سـەرگەورەی ئـاینی و دنیـاییی وڵات. ئەوانـە بـەبێ چـەندوچۆن شـیخ خالدیـان بـە شـتی وا تاوانبـار کـردەوە کـە نەیکردبوو. تیکرای زانایان و سەییدەکان و لە سەراوردیشیانەوە شیخ مارف رقیان لـە شیخ خـالد بـوو کـە تا دوینـێ پاشەکشـەی پـێ کردبـوون(34). ئـەم هەڵاتنـە زەبریکـی گورچکـبری لـە ریبـازی نەقشـبەندی لـە شـاری سـلیمانی وەشـاند. ئیتر مـەیدان بـە تـەواوی بـۆ قادری‌یـەکان چـۆڵ بـوو. ئاسـەواری ئـەم مەسەلەیە دواتر دەرکەوت.

## هەلویستی دەولەتی عوسمانی:

عوسمانیەکان سیاسەتی خۆیانیان بەرانبەر بە ریبازی نەقشبەندی لەسەر دوو بنچینە هەلنا:

1–نەخشی بزوتنەوەکە لەنیو میرنشینی باباندا.

2–دەستڕۆیی‌ی لە سەرتاسەری خاکی دەولەتی عوسمانیدا.

سـەعید پاشـای والیی بـەغداو داود پاشـای جینشـینی لـە سـەرەتای پەیدابوونی تەریقەتەکەدا باوەریان پێ هینا. مەبەستیان ئەوە بوو کۆنترۆلی بزوتنەوەکە بکەن و بۆ بیهیزکردنی میرنشینی بابانیش کـەلکی لی وەربگـرن. وەختیك سولتانی عوسمانی لە سالی 1881دا ئەوەی بۆ والیی بەغدا درکاند کە شتی وا نیە. ئەمجا شەیخولئیسلام زەکی زادە مستەفای عاسم هاتە سەر تەریقەتەکە. مادامیکی ریبازەکە سوودی بۆ پارچە پارچەیی و بیـهیزکردنی میرنشین هەبوو، سیاسەتی عوسمانی‌یانەی بەغدا لە کوردستاندا، پشتگیریی دەکردو ریگایشی بۆ کردەوە تا ئیش لە ناوچەکانی دیکەدا بکات. بەڵام هەر کە ئەم دەورە دوایی هات، سیاسەتی عوسمانی‌یەکان لە پشـتیوانی‌یەوە بـۆ چەوساندنەوەو سەرکوتکردن گۆرا، چونکە چیتر پیویسـتیان بـەوە نـەما کـە وەکو جاران پشتیوانیی لی بکەن. کاتیك مەولانا لە سالی 1820دا بە یەکجاری بۆ بەغدا هەڵات، داود پاشای کۆنە موریدی کەوتە تەنگ پـێ هـەلچنینی تـا ناچـاری کـرد بـەغدا بـەجێ بـهیلێ و بـە یـەکجارەکی کـۆچ بـۆ شـام بکـات. عوسمانیەکان لە شامیش دەستیان لە راوەدوونانی هەلنـەگرت، سـولتان بـۆ چاودیریکردنی چالاکی‌یەکانی دوو کەسی ناردە ئەوێ. هیندەی پـێ نـەچوو سـولتان لـە 1826دا فـەرمانیکی بـۆ بەرپرسـان دەرکـرد تـاکو چـالاکیی خەلیفەکانی مەولانا خالد قەدەغە بکەن. بابی عالی چـەند مـانگیك پـاش 7ی حوزەیرانی 1827ی رۆژی کۆچی دواییکردنی مەولانا، هەموو خەلیفەکانی لە

ئەستەمبوولّ گرت و بۆ بەغداو سلیمانیی دوورخستنەوە دوورخستنەوەیان بۆ پیتەختی بابان مەبەستیکی سیاسیی تیدا بوو چونکە دەیویست ئەم میرنشینە تووشی گیچەلی نەقشبەندی بکات.

*        *        *

نووسەران و شیخانی نەقشبەندی سوورن لەسەر ئەوەی بەرگیکی تەواو بە بەر گروپەکەیاندا بکەن. بەلاّم لە بەدبەختیی ئەوان، واقیعەکە ئەوساو ئیستاش دەری دەخا کە هەر گروپیکی نەقشبەندی، وەك هەموو گروپە سۆفییەکانی تر، بیجگە لە خواناسیی رۆحیی پاك و بیگەرد، لایەنی تریشی تیدا بەدی دەکری. میژووی سەدەو نیویکی نەقشبەندیی کورد هەر دەبیّ ئەوە بسەلمینیّ.

نوسین و نامەکان و ژیننامەی مەولانا خالد گوزارشت لە ریفۆرمیکی کۆمەلاّیەتی دەکەن کە پیی وابوە واقیعی کۆمەلاّیەتی و سیاسی و ئاینی لە رووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە لە "ئیسلامی رەسەنی" زەمانی پیغەمبەرو سەحابەتەکەی لایداوە، لەو هەلومەرجەدا ریفۆرم لە پیداویستییەکانی گۆرینی باری روحی و کۆمەلاّیەتیی مولسمانان موسولمانانە کە باریکە – بەرای ئەو– گەندەلّ بووە چونکە پاشاکانی موسلمانان روویان لە خراپە کردبوو. لەبەر ئەوە بیجگە لە خۆی ریّی بە هیچ خەلیفەیەکی نەدا تیکەلی کاربەدەستان و لایەنگرانی ریبازەکانی تر بن. بۆ هەر خەلیفەیەکی خۆی کە لە ئەستەمبولّ و نوینەرایەتیی دەکرد، حەوت مەرجی دانا چونکە ئەستەمبولّی بە چاوگەی خراپەو بەدرەوشتی دادەناو ئارەزوە کۆمەلاّیەتییە –سیاسییە ئاشکرانەکراوەکانی مەولانا ئەودیوی سنوری کوردستانیشان دەگرتەوە. لەبەر ئەوە مەولانا خەلیفە چالاکەکانی خۆی بە زۆربەی ولاّتە ئیسلامییەکانی دەولەتی عوسمانی وەرکرد. لە دوو ژن هینانْدا مەبەستی سیاسی بە ئاشکرا دەردەکەویّ. ویرای ژنی یەکەمی کە لە خیلە زۆرو زەوەندەکەی جاف بوو، ژنیکی بەغدایی هینا کە سەر بە یەکی لە بنەمالە ناودارەکان بوو، ژنیکی فەلەستینیشی هینا کە لە بنەمالەیەکی غەززەیی و دەسرۆ بوو. هەرچی ژنی چوارەمیشیەتی کە ریچ باسی کردوە، میژونوسان هیچی لە بارەوە نازانن.

مەولانا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا نوینەرایەتیی بالی ریفۆرمخوازی نیو بۆزوتنەوەی نەقشبەندی دەکرد ئەم بالە بیست سالّ پاش مردنی، بە شیوەیەکی دیار لە شیخانی ناوچەی هەوراماندا بەرجەستە بوو، بالیکی دیکەی دینامیکیتریش لە ئارادا بوو(35). کاتیك تویژی بازاری و ژمارەیەك خەلیفە نوینەرایەتییان دەکرد لە گەلیك نامەیدا



ئەوەمان دەستگیر دەبێ کە هیندیك لایەنگری بەتوندی پەرەیان بە بیری بەرەنگاری کردنی حوکمی بابان و شیخانی قادری داوە، کەچی مەولانا تیکۆشاوە قایلیان بکات بیروڕای خۆیان بگۆڕن(36). کاتیك تویژی بازاری پشتیوانی‌یان لی کرد، هیوای ئەوەیان پێ بوو ئامانجی تایبەتی خۆیانی پێ بەدی بهینن کە دژ بە دەسەڵاتی سیاسی و ئاینی – کۆمەڵایەتی‌ی میرنشینی بابان بوو. بەڵام بەشیکی زۆریان لە ساڵانی دواییدا بەهۆی نائومیدبوونیانەوە لیی تەکینەوە. ئەم بالە پاش نیو سەدە، لە لای شیخانی نەهری و بارزان بەرجەستە بوو. شیخ عوبەیدوللای نەهری‌ی ریبەری راپەرینی 1880، شیخ سەعیدی پیرانی ریبەری راپەرینی 1925 و مەلا مستەفا بارزانی‌ی ریبەری شۆرشی ئەیلوولی 1961 لە شیخانی ریبازی نەقشبەندی بوون.

سەرهەلدانی ریبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا جووڵانەوەیەکی شاری‌ی سەرەتایی‌ی دژ بە کۆنترۆلکردنی شاری سلیمانی لە لایەن دیهاتی کوردەوە بوو، جوڵانەوەیەك بوو گوزارشتی لە پیویستی‌ی بەشیکی بەرینی کۆمەلی کوردەواری بە دەسەڵاتیکی سیاسی‌ی جیا لە دەسەڵاتی میرو دەرەبەگی کوردو دەسەڵاتیکی ئاینی –کۆمەڵایەتی‌ی جیا لە تەریقەتی قادری دەکردو هەروا گوزارشتی لە دوژمنایەتی کردنی دەسەڵاتی عوسمانی‌یەکانیش دەکرد. ئەگەر ئەو بزوتنەوەیە وەك بزاڤیکی شاری سەری نەگرتبێ، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئەوسا شاری کورد نەگەیشتبوە ئاستیکی وا بەربەرەکانێ‌ی دیهات و رایەلەی پەیوەندی‌یەکانی بکات. ئەو بزوتنەوەیە وەك فاکتەریکی ئاینی و کۆمەلایەتی بەشداری‌ی لە بیهیزکردنی دەسەڵاتی میراندا کرد. ئەوە یەکەم جاریشە لە میژووی میرنشینی کورددا کە میریك شیخیکی گەورە بەم شیوەیە لە میرنشینەکەی دەربکات. ریبازی نەقشبەندی توانی دەست بەسەر زۆربەی ناوچەکانی نفوزی قادریدا بگرێ و، نەك هەر بەربەرەکانێ‌ی کرد بەلکوو ژمارەی لایەنگرەکانی لەویش زۆرتر بوون. پیش ئەو میژووە ناکۆکی‌یەکی ئاینی‌ی وا لە کوردستاندا رووی نەداوە کە قەوارەو ئاستی ناکۆکی قادری – نەقشبەندی هەبووبێ هیشتا رەنگدانەوەی ئەم ناکۆکیە لە پەیوەندی‌ی هەردوو ریبازدا تا ئەمرۆ دیارە. گرنگترین هۆ کە وای کرد ریبازی نەقشبەندی نەتوانێ هیندیك ئامانجی خۆی لە چوارچیوەی دەولەتی عوسمانیدا جێبەجێ بکات، سیاسەتی ناوەند بەهیزکردن بوو کە سولتان مەحموودی دووەم پیرەوی کردو بە دەستوەشاندن لە یەك لە دوای یەکی ریبازە سۆفی‌یانەکان دوایی‌ی هات.

## پەراویزو سەرچاوە:

1–محمد امین، الدولة العثمانیة و الشرق العربي، القاهرة، التأریخ بلا، ص 108.

2–محمد عاصف هاشم، رستم التواریخ، طهران، الطبعة الثالثة، 1978، ص 321.

3-Joubert, pierre- Amedee Emiline, Voyage en Armenie eten Perse, Paris, 1821, P 77.

4-g. Campanile, Historie du Kurdistan, Tracluit de I. Italien par thomas Bois, manuscipt non publie, p. 2.

کامپانیل قەشەیەکی ئیتالی‌یە، لە سالی 1802 بە دواوە تا 1815 لەگەڵ دەستەیەکی مژدەبەردا بۆ مووسڵ و ئامیدی نیردرا. سەری لە گەلیك ناوچەی وڵاتی میزۆپۆتامیاو کوردستان داوە. ئەم کتیبەی لە سالی 1818دا لە ناپۆلی‌ی ئیتالیا بلاوکردەوەو تۆما بوا بە ناونیشانی "میژووی کوردستان"ەوە بۆ فەرەنسەیی‌ی وەرگیرا. بەڵام ئەو وەرگیرانە تا ئیستا بلاونەبوەتەوە، دانەیەکی بە تایپرایتەر لە نامەخانەی ئامۆژگای لیکۆلینەوەی خۆرهەڵاتە لە پاریس. ئەم کتیبە سەرەرای زۆری‌ی زانیاری‌ی چەوت کە هەلقولاوی گیانیکی هەلچووی دژ بە کوردە، کۆمەلیك سەرنج و ژمارەی بە سوودی تیدایە.

5–رەنگە ئەم شەقلەی دوایی‌یان چەند نیشانەیەکی پرسیار لە بەردەم هیندیك پسپۆری کوردناس قوت بکاتەوە، لە کاتیکدا بایەخی بۆ ئەم بابەتە زۆر زۆرە، ئەویش لەبەرئەوەی –بە تێ روانینی ئیمە– بزاڤی نەقشبەندی لە سلیمانی دەچیتە نیو ئەم چوارچیوەیە. بۆیە دوو نموونەی بۆ دەهینینەوە:

1–ریچ چەند زانیاری‌یەکی لەسەر یاخیبوونی دانیشتوانی شاری بانەی کوردستانی ئیران و ئەو کوشتارە باس کردەوە کە حکوومەتی ئەردەڵان دەرهەق بە کۆمەلیك باجنەدەر بە بەرچاوی خەلکی شارەکەوە کردویەتی. بروانە:

Rich, Claudius James, narrative of a Residence in Kurdistan and on the site of Nineveh, 2 volumes, volume 1, London, 1836l1972, p. 45.

ب–شامیلۆف باسی دوو پەناگەی لە کوردستانی باکووردا کردووە کە چەوساوەکانی سەردەستی میرانی کورد پەنایان بۆ بردووە. بروانە: شامیلۆف، حول مسألة الاقطاع بین الکرد، ترجمة من الروسیة الدکتور کمال مظهر أحمد، بغداد، 1977، ص 70.

6–کەم دەرفەتی، بواری ئەوەمان نادات لا لەو مەسەلەیە بکەینەوە کە ریبازی نەقشبەندی لە رووی ئاینی– سۆفیتی و میژووییەوە چی‌یە. دەکریت زانیاری لەم سەرچاوانەی خوارەوە لەسەر ئەم بابەتە دەست بخریت:

–محمد أمین بن محمد الخاتي، الحدائق الوردیة في حقائق اجلاء النقشبندیة، دمشق، 1989.

-Algar, Hamid, the Naqshabandi Order: A prilimianery survey of its history and significace, in studia Islamica, paris, 1979, p.p. 123-152.

-Aziz, Ahmed "the Naqshabandi Rea", in studies in Islamic Culture in the Indian Environment, Ozford 1964. P. 182-190.

بۆ سەرچاوەی زیاتریش بروانە:

Algar, Hamid, "Bibliofgraphi cal notes on the Naqshabandi Tariqat in Essays in islamic philosophy and science, Albany- New York, George F. Horani, 1975, p.p. 154- 259.

ئەو نامەیەمان بیبلۆگرافیایەکی گشتی‌ی 176 سەرچاوەیەیی لەمەر ئەم ریبازە تیدا بەرچاو خراوە.

7–زۆر زەحمەتە سنووری ئەم میرنشینە بە وردی بزانین. ئەوەی میژوونووسان بۆیان کیشاوە سنووریکی مەزەندە کراوە، چونکە ئەو سنوورە بە دریژایی‌ی ساڵان چەندین جار گۆڕاوە. ئەوەی ئیمە بەرچاومان خستووە لە سنووریکی نیزیککراوە تیناپەرێ.

8–س.ه. لۆنگریك، اربعة قرون من تأریخ العراق الحدیث، ترجمة جعفر الحیاظ، بغداد، 1968، ص 209.

9–هەمان سەرچاوە، ل 285.

10–الشیخ محمد الخال، الشیخ معروف النودهی البرزنجیی، بغداد، 1961، ص 61.

11-Rich, op. Cit., p. 119.

12-Campanile, op. Cit., p. 14.

13-I bid, p. 16.

14-Rich, op. Cit., p. 120.

15-I bid, p.p. 49-95.

16-I bid, p. 120.

17–سەبارەت بەم کاروانە رێیانە، بچۆوە بە کتیبی: الدکتور شاکر خصباك، الاکراد: دراسة جغرافیة اثنوغرافیة، بغداد 1972، ص 223–224ز

18-Rich, op. Cit., p. 119.

19-جمال بابان، السليمانية، من نواحيها المختلفة، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد، بغداد، 1981، ص 417.

20-لە هەموو ئەو ولاتانەدا کە ئەم ریبازەیان تیدا بلاوبووەتەوە، چینی ناوەراست و بە تایبەت تویژە بازاریی‌یەکان لایەنگریان لەو ریبازە کردوەو بنکە کۆمەلایەتی‌یە سەرەکیەکەیان پیکهیناوە. ئەمە بۆ گەلیك هۆ دەگەریتەوە کە گرنگترینیان راوبۆچوونی ئەو ریبازەیە دەربارەی کار. یەکیك لە یازدە بنچینەکانیشی خەلوەکیشی‌یە لە نیو ئەنجومەندا "خلوت در انجمن". واتە تەنیایی لەنیو کۆمەلدا. بە مانایەکی دی مورید بۆ بەدەست هینانی بژیوی خۆی بە جەستە لە نیو خەلکدایەو بە گیان لەگەل خوادا.

21-دەکریت بۆ زیدە زانیاریی وردتر لە بارەی ژیانی مەولانا خالدەوە بچنەوە سەر:

-الشيخ محمد الخال، المصدر السابق، 38-53.

-ابراهيم فصيح البغدادي، المجد التالد في مناقب الشيخ خالد، اسطنبول، 1872.

-عباس العزاوي، مولانا خالد النقشبندي، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد الاول، بغداد، 1973، ص 696-727.

-مەلا عەبدولکەریمی مودەرریس، یادی مەردان -مەولانا خالدی نەقشبەندی، بەغدا، 1979.

-محمد بن سليمان البغدادي، الحديقة الندية في آداب الطريقة النقشبندية و البهجة الخالدية، مصر، 1895، ص 30.

23-ریچ لە کتیبەکەیدا زۆر جار باسی ئەم بابەتەی کردووە. سەرەنجام چاوی بە ژمارەیەك بازاری کەوت و قسەی لەگەلدا کردن. ئەوانیش سکالایەکی زۆریان بە دەست گوشاری دەرەبەگ و کاربەدەستانەوە بۆ هەلرشت.

24-مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، هەمان سەرچاوە، ل 83-86.

25-Rich, op. Cit., p. 141.



26-عباس العزاوي، المصدر السابق، ص 719، ئاشکرایە کە جیاوازیی هەردوو ژمارەکە زۆرە. یەکەم نیگا هانمان دەدات باوەر بەوەیان بهینن کە ریچ باسی کردووە، چونکە سالی 1820 خۆی لە کوردستان بووە، باوەریشمان هەبێ کە ئەو ژمارەیەی لە لایەن عەزاوی‌یەوە بەرچاو خراوەن لە راستی خالی نیە:

1-ریچ بە تەنێ باسی ولاتانی عەرەب و تورکیای کردووە، لە کاتیکدا مەولانا ژمارەیەکی زۆر موریدی لە داغستان، ئەفغانستان، پاکستان، هیندستان و ئیمپراتۆریی فارسی هەبووە.

2-عەزاوی وەکوو پیشە زۆربەی کاتی، ئەگەرچی ناوی ئەو سەرچاوەیەی نەبردووە کە باسکردنی ئەم ژمارەیە پشتی پێ بەستووە، بەلام ئەوپەری شارەزای دەستنووس بووە. لەوانەیە کاتی نووسینی گوتارەکەی لەسەر مەولانا خالد، بە پیویستی نەزانیبێ ئاماژە بۆ سەرچاوە بکات یان لە بیری چووبێ.

27-Van Bruinessen, M.M., Agha, shailkh and political orgamization of Kurdistan, Amsterdam, 1978, p.p. 284-5.

28-Edmonde, C. J.Kurds, Turks and Arabs, Londoan, 1957, p. 77.

29-ابراهيم فصيح البغدادي، المصدر السابف، ص 41.

30-Rich, op. Cit., p.p. 303- 21.

بروانە دەقی نامەکە لە "یادی مەردان"، ل 396-398.

32-مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، سەرچاوەی پیشوو، ل 354.

32-هیندیك ئەمە دەلین، بەلام واقیعەکە پیچەوانەی ئەوە دیتە بەرچاو. کوری پاشا لە 12 تشرینی دووەمی 1820 مردووە، لە کاتیکدا مەولانا هەشت رۆژ لەوەبەدوا هەلاتووە. ریچ لەو بیست لاپەرەیەدا کە لەسەر رووداوەکانی ئەم رۆژانە نووسیونی، لە شتیکی وا دواوە بۆنی ئەم بۆچوونەی لی بێ.

34-Rich, op. Cit., p.p 321-22.

35-ژمارەیەك لیکۆلیاری نەقشبەندیزان لەسەر ئەوە پیکهاتوون کە ناوی بالی رۆشنبیری بەسەر شیخانی هەورامانداو بالی شۆرشگیر بەسەر شیخانی نەهری و بارزاندا ببرن. پیمان وایە هەردوو وشەکە تەواو پر بە پیستی نیشانەکانیان نین. ئەوەتا نەقشبەندیی هەورامان بە تایبەتی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە گەلیك لە مۆرکە "رۆشنبیری"یەکەی لە دەست داوەو مۆرکی فیرکردنی رۆتینیی نوقستان جیی گرتونەتەوە. شیخانی ئەم بالە لەبەر چەندین هۆ کە دەرەتانی لیتویژینەوەیان بۆ ئیرە تەنگەبەرە، لە زۆر بنچینەی ئەم ریبازەیان تیپەراندووە. بۆیە وامان پێ باش بوو ناوی بالی "فیرگەر" یا "ریفۆرمخواز"ی لی بنیین. هەرچی بەکارهینانی زاراوەی بالی "شۆشگیر" یشە پیمان لەبار نیە، چونکە چەمکی گشتیی شۆرش بە زەحمەت لەگەل واقیعی ئەم بزاڤانەدا دەگونجیت. بۆیە بەکارهینانی زاراوەی بالی داینامیکیمان هەلبژارد.

36-مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، نامەکانی ژمارە 49 و 50 و 51 و 52، ل 129-4.

**سدیق سالح لە عەرەبی‌یەوە وەریگیراوە**

**ژیدەر: گۆڤاری (دراسات کردیە) ژمارە 1ی کانونی دووومی 1984.**

**سەرچاوە:**

**گۆڤاری سەنتەری لیکۆلینەوەی ستراتیجی (سیاسەتی دەولی) ژمارە 21 شوباتی 1998.**

# کۆچی مەولانا بەرەو بەغداو جێهیشتنی کوردستان

دیدی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس

لەبەرئەوەی کە مەسەلەی کۆچ کردنی دواجاری مەولانا لە سولەیمانی بووەو ئەبێ بە هۆی قسەلێکردنی گەلێ کەس و جاروباریش کەسانی بێئاگا بە ئارەزووی خۆیان لە مەسەلەکە ئەدوین و زیاد و کەم لە رووداوەکانی ئەو رۆژەدا ئەکەن و راستی ئاوەژوو ئەکەن بە جۆرێ کە ئەبێ بە مایەی ئازاردانی دلی گەلیکی تر، ویستم بۆ دەبرینی راستی باسی غەوغا و ئاژاوەی خەلك بەرامبەر بە مەولانا لەم پەراویزەدا بنووسم و لەسەر مەعلووماتی واقیعی و عیلمی و بەراوردکاری بەلگەکان راستەقینەی ئەو کارەساتەو هۆکانی دەربخەم.

مەشهووره کە مەولانا کاتێ ئیجازەی ئیرشادی لەسەر دەستی شیخ عەبدوللای دیهلەویدا وەرگرت و لە هیندستانەوە گەرایەوە بۆ کوردستان و هاتەوە سولەیمانی و دەستی کرد بە ئیرشاد و تەبەعەی زۆر بوون، مەرحووم شیخ مەعرووفی نۆدێ بوو بە ناحەزو دژی و بوو بەهۆی دەرچوونی لە سولەیمانی و کۆچ کردنی بۆ بەغدا.

ئەمە ئەوەیە کە لە ناو خەلکدا مەشهووره. بەڵام ئەبێ هوشیارو ئاگادار بین ئەو رووداوە هەروا بەو جۆرە و بەو هۆیەوە نەبوە بە کورتی، بەلکو گەلێ ئەسبابی واقیعی لەو مەسەلەیەدا هەن بوون بە هۆی کۆچ کردنی مەولانا. جارێ با پیشان ئەم راستی‌یانە بخەینە بەرچاو:

یەکەم: ئەو تەریقەتە کە مەولانا ئیرشادی خەلکی بۆ ئەکرد، تەریقەتی نەقشبەندی بوو. ئەم تەریقەتە هەرچەند لە زەمانی کۆندا بووەو لە کوردستانیشدا نیشانەی بووە، بەڵام لەو چەرخەدا وەکو تەریقەتیکی ناسراو لە کوردستاندا نەبوەو لە ناو خەلکدا ناوبانگیکی نەبوە. لە تەریقەتی نەقشبەندیدا ئەدەب کردنی مرید لە مورشید زۆر بە قیمەتە. زوربەی مریدەکان لە بەرامبەری مورشیدەکانیانەوە وەکو خزمەتکار بەرابەر بە گەورەی خۆیان رائەوەستن. ئەم حالەتە ئەگەر لەسەر ئیعتیباراتی فیزو تەکەببور بێ گوناهیکی نابارو ناهەموارەو دین قوبوولی ناکات.

یەکێ لە ئادابەکانی تەریقەتی نەقشبەندی رابیتەکردنی مورشیدە، واتە مرید چاو بە یەکدا ئەنێ و رۆحانی‌یەتی مورشیدەکەی خۆی بە خەیاڵ حازر ئەکات و وائەزانێ هەمیشە بەرەکەت و پیرۆزی لە لایەن خواوە ئەگات بە رۆحانی‌یەتی پیغەمبەر و لەلای ئەویشەوە ئەگات بە ئەرواحی ئەولیا و مورشیدیش لە ئەولیایەو لە رۆحی ئەویشەوە ئەگات بە دلی مریدە خاوەن رابیتەکە.

ئەم رابیتەیە هەرچەند لە نوصووصی هەر چوار مەزهەبەکەی ئیسلامدا دەلیل و بەلگە لەسەر راستی و دروستیی هەیە، بەڵام خەلکی هەرەمەو ئەو مەلایانەی لەم راستی‌یە بێئاگان، باش تەماشای ناکەن و ئینکاری ئەکەن و جارجاریش زۆر بە توندی بەرەنگاری ئەوەستن.

یەکێ تر لە ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی تەوەججوه کردنە کەواتە مورشید لە بەردەمی مریددا دائەنیشێ و هەردولایان چاو ئەنین بە یەکداو مورشید رووی دلی خۆی ئەکاتە دلی مریدەکەی بۆ ئەوەی ئەو نوورو بەرەکەتەی لە دلی خۆیدایە بگات بە دلی ئەو و بەو نوور وبەرەکاتە دلی لە خەیالی خراپ پاك بکاتەوە، وەك چۆن زەرەبین بەرامبەر بە رۆژ ئەگیریت و بەهۆی نووری رۆژەوە کاغەز ئەسووتینێ، بەو جۆرە مورشیدیش تەئسیر ئەخاتە ناو دلی مریدەکەیەوە. ئەمەیش هەروەها لەناو خەلکا نەبیسراو بووەو خەلك ئولفەتیان پیوە نەگرتووەو بووە بەهۆی ئەوە کە هەندێ لە مەلایانی بێئاگا ئینکاری بکەن.

یەکی لە ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی (ذیکری سیرری)یە، واتە سالیك بە خەیاڵ بە شیوەیەکی تایبەتی کەلیمەی (الله) بەسەر دلدا رابویرێ و هەناسەی خۆی بگرێ و بەتەنها ئەو کەلیمەیە بەسەر دلیدا بهینێ و تا دلی نوورانی ئەبێ و فیری زیکری سیرری ئەبێ و گەلێ نیشانەی نوورانی‌یەتی‌و بۆنی خۆش لەناو دلیدا پەیدا ئەبێ. ئەمەیش هەر لەلای تیکرای مەلایان نەزانراو و ئولفەت پیوە نەگیراو بووەو لایان وابووە هەر زیکریك خاوەنەکەی بە گویی خۆی نەیبیستێ بێ ئیعتیبارە.

دووهەم: هەرکەسێ وردببیتەوە ئەزانێ یەکی لە هۆ بەهیزەکانی ئاشووب و هەرا لە هەر لایەك حەسوودی‌یە. واتە: کەسێ ئەبینێ هاومالیکی ئەگات بە پایەو مایەیەکی دنیایی وەکو دارایی یا شان و شکۆ یا وەزیفە یا پایەیەکی دینی وەکو پیشەوایی و خەلك شوینی ئەکەون، کابرای حەسوود ئاگری تێئەچێ و ئەکەویتە هەوڵدان یا ئەوی تر ئەفەوتینێ یا هەرایەك ئەنیتەوە یا خۆی ئەدا بە قەلبەیەکدا.

گەلێ لە مەلایانی ناوچەی سولەیمانی کە لە خویندندا هاوریی مەولانا بوون و خۆیان لەو بە باشتر تەماشا کردووە، لە وەزعی مەولاناو لە پایەی بەرزی لای میرانی بابان و خەلکی شار و دەوروپشتی نارەحەت بوون، بەڵام دەستیان نەرۆیشتووە هیچ بکەن. یەکە زانای عیلم و تەریقەتیش لەو رۆژەدا لە ناوچەکەدا شیخ مەعرووفی نۆدێ بووە کە مەلایەکی گەورەو مورشیدیکی پایەبەرز بووەو بەهۆی عەشرەت و تایەفەیەوە زۆر خاوەن دەست بووە، چوونەتە لای فیتنەیی‌یان کردووەو هەر شتێ کە بە عەیبیان زانیوە کردوویانە بە چەند قات و وایان نیشان داوە کە ئەم مەولانایە هاتووە دین تیك بدا و ئاشووب بنیتەوەو شتی نارەوا دابمەزرینێ. ئەویش لەبەر ئاموشۆ نەکردنی مەولاناو دل سافیی خۆی و سویندخواردنی ئەو کەسە درۆزنانە ئالۆز بووەو بە واجبی ئایینی خۆی زانیوە لەسەر ئوسوولی حەدیسی پیرۆزی پیغەمبەر کە ئەفەرمویت "من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فان لم يستطع فبلسانه، فان لم يستطع فبقلبه" واتە هەرکامیکتان شتیکی ناپەسەندی دی، با بە دەست بیگۆری و ئەگەر نەیتوانی با بە زمان بیگۆرێ و ئەگەر هەر نەیتوانی با بەدڵ بیگۆرێ" تیکۆشاوەو لە دژی مەولانا جووڵاوەتەوە. سەرەنجام کە راستیی بۆ دەرکەوتووە پەشیمان بووەتەوەو شیخ حوسەینی قازی و چەند سەیدیکی تری ناردووەتە لای مەولانا بۆ عوزر هینانەوە.

سیهەم: تاقمی لەو جۆرە مەلایانە ئاشووب گیرتر ئەو کەسانە بوون کە ئیددیعای شیخیەتی و پایەی ئیرشادیان کردووەو لە راستیدا خاوەنی ئە و پایەیە نەبوون. ئەمانە بە جارێ ئاگریان تێ بەربووەو هەستیان بە ماڵویرانیی خۆیان کردووە چونکە مەولانا خاوەنی پایەیەکی بەرزی ئایینی وا بووە ئەوان نەیانتوانیوە بە هیچ پیا بگەنەوە. مەولانا کەسێ بووە بە راستی پیرەویی شەرعی کردووەو کەسێ ئینسافی بووبێ نەیتوانیوە پیچەوانەی شەرعی لەسەر ئیسپات بکات. هەر کەسیکیش چووبیتە تەریقەتەکەیەوە لە ماوەیەکی کەمدا حالی گۆڕاوەو دڵ و گیانی نوورانی بووە.

زوربەی ئەوانەی کە چوونەتە تەریقەتەکەی مەولاناوە مەلای گەورە گەورەو لە خانەدانی پایەبەرز بوون وەك شیخ قەسیمی گەورەو تەختەیی و شیخ عەبدولقادری شەمزینانی و مەلا موصتەفای کوری مەلا جەلالی خورمالی و مەلا عەبدوللای کوری مەلا عەبدولرەحمانی جەلیی کۆیی مەلا یەحیای مزووری و شیخ ئیسماعیلی هەنارانیی بەرزنجەیی و شیخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەلوویی بەرزنجەیی و ئەم جۆرە کەسانە کە بە هۆی شوین کەوتنیانەوە بۆ مەولانا عالەمەکە بەجاریَ سەرگەردان بووەو سەرسام بوون لەمە کە ئەبیَ مەولانا چۆن پیاویَ بیَ کەسانیَ وەك ئەمانە بن بە مریدو مەنسووبی.

بەم چەشنە کەرتە شیخەکان بەجاریَ ئاگریان تیَچووەو چارەیان نەماوە مەگەر هاتوچوو کردن و پەنابردنە بەر شیخ مەعرووفی نۆدیَ و بوختان و درۆکردن لە خزمەتیدا وەك پیشتر باسم کرد.

بەڵام لەگەڵ هەمو ئەمەشدا بە بیرو رای من هۆی هەرە گەورەی کۆچی مەولانا لە سولەیمانی ئەمانە نەبوون کە باسمان کردن. بەلکو ترسی مەحموود پاشای بابان بووە. براو ئامۆزاکانی پاشاو هەروا گەلی لە پیاوماقوڵانی بابان لەگەڵ مەولانا جۆرە پیوەندی و مەنسووبیەتیکیان بووەو خۆشیان ویستووە. هەرکاتیَ مەولانا ئیشارەتیکی کردبیَ هەموو ئەمانە لە بەردەستیدا بوون. بۆیە مەحموود پاشا زۆر لەوە ترساوە کە رۆژیَ لە رۆژان مەولانا داوا بکا لیان شوینی پاشا نەکەون و لەگەڵ کەسیکی تر بن و زانیویە ئەمانە دەس بە جیَ فەرمانەکەی مەولانا بەجیَدینن. لەبەرئەوە حەزی لە مانەوەی مەولانا نەبوە لە سولەیمانی و هەمیشە ویستوویە جیی پیَ لەق بکا.

ئەگەر مەسەلە ئەمە نییە، ئەی پاشا بۆ نەهاتووە ئەنجومەنیکی مەلا گەورەکان پیکەوە بنیَ ۆ موناقەشەو موجادەلە لەگەڵ مەولاناو لیکدانەوەی ئەو رەخنانەی لە مەولانایان گرتبوو؟ بۆچی خۆی وەك سەیران کەر تەماشای رووداوەکانی ئەکرد؟ ئەی بۆچی پاش کۆچی یەکەمی مەولانا لە سولەیمانی کە حالی بوو مەولانا چۆن پیاویکە و بوونی لە ناوچەکەدا مایەی شەرەف و شان و شکۆیە بۆ هەموان، چوو تکای لی کردو هینایەوە، کەچی دیسانەوە یارمەتی نەداو پاریزگاریی نەکرد تا بە جاریَ مەولانا دلگران بوو لە وڵاتەکەو غەریبی ئیختیار کرد؟

راستەکەی مەولانا خالید ئەوەندە خاوەن فویووضات و ریژەن بووە لە مەلایەتی‌دا تەنانەت کەسانی بیَقابیلەتیش بەشیکیان لە بەهرەی ئەو دەسگیر ئەبوو. ئەوانەش کە قابیلەت دار بوون لە خزمەتیا ئەبوون بە مەلای گەورەو شایان و لیهاتوو. لە عولوومی مەعنەوی و رووناك کردنەوەی دل و دەروونیشدا سوودیکی زۆریان لی وەرئەگرت بەجۆریَ کە لە ماوەیەکی کەمدا ئەبوون بە ریَ نموونی کەری خەلکیکی زۆر. لەم رووەوە خەلکیکی زۆر لە مەولانا خرئەبوونەوەو هەمیشە لە دەوروپشتی مەولانادا جەماوەریکی زۆر لیشاوی کردبوو.

هەر لەبەر ئەم هۆیە بووە کاتیَ کە مەولانا لە بەغدا بووە لە سەردەمی والییەتیی داوود پاشادا، خەلیفە لە ئەستەموولەوە نامەیەکی نهینی ئەنیری



بۆ بەغداو ئەپرسێ ئاخۆ ئەم هەموو خەلکەی دەوری مەولانا لە بەرچی و بەهۆی چی‌یەوە لیی کۆبوونەتەوە؟ ئاخۆ تەماعی دنیایی مەولانا چۆنەو لە دنیادا بە تەمای چی‌یە؟ ئەویش لە وەڵامی خەلیفەدا ئەنووسیتەوە ئەم زاتە مەظهەری فویووضاتی ئیلاهی و مەناری ئەنواری خودایەو جاذبیەتی رۆحیی لە پایەیەکدایە چۆن میغناطیس ئاسن رائەکیشێ، ئەویش وا دڵ و دەروونی ئینسان داگیر ئەکاو روونی ئەکاتەوەو بەرەو لای خودای ئەباو ئەیخاتە سەر ریی طاعەت و پیرەوی کردن لە سوننەتی پیغەمبەر دروودی خوای لی بێ. ئارەزوویشی لە مالی دنیا وەکو ئارەزووی شازادەیەکی لاوە لەکاتی تیریدا لە پارچە کولیرەیەك کە سەگیکی گروێ بە لیکی دەمی تەری کردبێ.

هۆیەکی تری نەمانەوەی مەولانا لە وڵاتی خۆماندا ئەوەیە وەك بەراوردکراوە پیاوی گەورەی کوردەواری ئەگەر کەنار نەبێ لە خەلك، واتە لە کیوێ یا لە شیوێ یا لە پەنایەکدا نەبێ و بی‌یەوی لەناو کۆمەلی شارەوانیدا بژی دەوام ناکا، چونکە لای ئیمە وابووە بە باو قەدری کەسانی خزمەتگوزارو گەورەی خۆمان ناگرین مەگەر ئەو کەسە خاوەن عەشرەت و دەسەڵاتیکی وا بێ خەلك لیی بترسن، بەلکو ئەگەر خاوەن عەشرەت و دەسەڵاتیش بێ هەر هەراسان ئەبێ لە خەلکی وڵاتەکەو، چەند جار ئەم راستی‌یە بەراورد کراوە. تەنانەت شیخ مارفی نۆدی خۆیشی کە بە بەربەرەکانێ کەری مەولانا دانراوە، ویستی لە کوردستان کۆچ بکاو داوای ئیزنی لە سولتانی ئەستەموولٚ کرد، بەڵام سولتان ئیزنی نەدا. کاك ئەحمەدی شیخی کوریشی زۆر زۆر لە وڵاتی خۆی وەرس بووەو تەنها لەبەر عەشرەتەکەی ماوەتەوە کە نەیانهیشتووە وڵاتی سولەیمانی بەجێ بهیلێ. مەولانا خالیدیش هەروا وەرس بوو سولەیمانیی بەجێهیشت.

مەبەستم لەم دریژە پیدانە ئەوەبوو هۆی دەرچوونی مەولانا لە سولەیمانی گەلی شتی زۆر لە نیوان تیکچوونی ئەوو شیخ مارفی نۆدێ موهیمتر بووە. ئەو و شیخ مارف پاشان ئاشت بوونەتەوەو نیوانیان چاك بوەتەوە، بەڵام ئەو هۆ موهیممانە ئەوساش بوون و ئیستاش وینەیان بۆ رووداوی تر هەیەو گەردو تۆزی تەبیعەتی وڵاتی خۆ نەناس تا دنیا دنیایە تەواو نابێ.

* * *

وا من لیرەدا بیرو رای خۆمم لە بارەی هۆی کۆچ کردنی مەولاناوە لە کوردستان بۆ شام نووسی. ئاشکرایە لەم بارەوە زۆر شت نووسراوەو ئەم شتانە لەو کتیبانەدان کە بۆ لەسەرکردنەوەی مەولانا یا لە دژی مەولانا نووسراون. لەم مەیدانەدا قسەی کەسیکی تریش هەیە شایانی ئەوەبێ ئاگاداری بین. ئەم قسەیە قسەی گەرالی ئینگلیز (کلۆدیۆس جەیمس ریچ)ی نوینەری کۆمپانیی هیندی رۆژهەڵاتی ئینگلیزی‌یە کە لە بەغدا دانیشتووەو لەو سەردەمەدا گەشتیکی لە بەغداوە کردووە بۆ سولەیمانی و کوردستانی بەشی ئیران.

کلۆدیۆس جەیمس ریچ لەو سەردەمەدا، کە مەولانا سولەیمانیی بۆ دواجار بەجێهیشتووە لەوێ بووە، هەروا لە سەردەمی برەوی شان و شکۆو پیوەندیشی لەگەڵ میرانی بابان هەر لەوێ بووە. ئەم پیاوە لە هەردوو حالەتەکەدا باسی مەولانا ئەکا. ئیمە بە نیازی ئەوە نا کە قسەی ئەم پیاوە بکەین بە بەلگە، هەرچەند مەشهوورە (و الفضل ما شهدت به الاعداء) و دیاریشە کابرایەك کە بە نیازی پیچەوانەی سوودی وڵاتانی ئیسلام و موسلمانان هاتبیتە ئەم وڵاتە، بە دۆستی پیشەوایەکی موسلمانانی وەك مەولانا خالید دانانرێ، بەلکو هەر بۆ ئاگاداری‌یەکی وردتر و روونتر، لە دوادواییی بیرورا تایەبتی‌یەکەی خۆمەوە لەمەر کۆچی مەولانا کە پیوەندیکی تەواوی بە پیوەندیەوە (پیوەندی مەولانا) بە میرەکانی بابانەوە هەیە، زوربەی ئەو برگانە وەرئەگیرمە سەر کوردی کە ریچ لە کتیبەکەیدا لە بارەی مەولاناوە نووسیونی، وەك لیوا بەهائەددین نووری وەری گیراوەتە سەر عەرەبی.

ریچ لە لایەکی کتیبەکەیدا ئەلێ:

"موسلمانیکی دەست لە دنیا داشتووی گەورە لە سولەیمانی ئەژی، ناوی شیخ خالیدە، بەڵام کوردەکان لایان وایە سووکی‌یە بۆی لە (حەزرەتی مەولانا) بەولاوەی پێ بووترێ. موسلمانەکان قسەکانی لە پلەی حەدیث (ی پیغەمبەر)دا دائەنین، ئەم شیخ خالیدە لە خیلی جافە، تەریقەتی نەقشبەندیی هەیە، لە دیهلی لەسەر دەستی سۆفیی بەناوبانگ سولتان عەبدوللادا چووەتە سەر ئەم تەریقەتە. دوازدە هەزار مریدی لە ناوچە جیاجیاکانی تورکیاو وڵاتانی عەرەبدا هەیە. کوردەکان هەموو بە وەلیی دایئەنین. زۆریشیان لە ریزی پیغەمبەری خۆیاندا ریز ئەکەن. عوثمان بەگ پیی وتم ئەویش و پاشایش و بەلکو هەموو سەرکردە کوردەکانیش مریدی ئەون. شیخ خالید هیچ نەبێ لەگەڵ وەلیی موسلمان شیخ عەبدولقادر (مەبەست حەزرەتی غەوثە-و)ی بەناوبانگدا لە یەك پلەدان".

(کلوديوس جيمس ريچ، رحلة ريچ في العراق عام 1820، الجزء الاول، نقلها الى العربية بهاءالدين نورى، ص 98، بغداد 1951).

ریچ لە لایەکی تری کتیبەکەیدا شتیکی تر ئەگیریتەوە نیشانەیەکی گەورەی پایەی مەولانایە لای میرانی بابان. ریچ ئەلێ:

*".. کە سەرەنجام، پیش ماوەیەکی کەم، مەحموود پاشا بریاری‌دا خۆی بدا بە دەست تورکەکانەوە، لەگەڵ عەبدوللا پاشای مامی و عوثمان و سولەیمانی برای چوون بۆ لای شیخ خالید، پیاوی لە خواترسی گەورەی ئەو سەردەمەی سولەیمانی. هەر سێ (عەبدوللا پاشاو عوثمان و سولەیمان) سویندیان خوارد کە مل کەچ بن بۆ مەحموود پاشا. لەبەرئەوەش کە بە دووریان نەئەزانی میری کرماشان هەوڵ بدا دلی یەکیکیان رابکیشێ بۆ لای خۆی و هانی بدا لە دژی پاشا بۆ دوژمنایەتی لەگەڵ تورکەکان، دەستیان نایە سەر شمشیرو سویندیان خوارد بە قورئان و تەلاقیان خوارد کەوا هەرکامیکیان نامەیەکی لە تورکیا یا لە ئیرانەوە بۆ هات، لە مالی شیخ خالیددا هەلی پچرێ بە حوزووری هەرکەس کە هەر چواریان بریاری لەسەر بدەن.."

(سەرچاوەی پیشوو، لاپەرە 103)

بۆ جاری دواییش ریچ باسی مەولانا ئەکاتەوەو ئەلێ:

"25ی تەشرینی یەکەم.

"ئەم بەیانی‌یە شیخ خالیدی بەناوبانگ هەڵات. لەگەل ئەوەش کە هەڵاتنەکەی لەپر و بە نهینی بوو، توانی هەر چوار ژنەکەی لەگەل خۆی بەرێ. هیشتا نەزانراوە بەرەو کوێ رۆیشتووە. چەند رۆژێ لەمەوبەر کوردەکان لە پلەیەکی بەرزتر لە پلەی عەبدولقادر (مەبەستی حەزرەتی غەوثە- )دا دایان ئەنا. پاشا عادەتی وابوو لە بەردەمیا رائەوەستا قلیانی بۆ تێ ئەکرد، کەچی ئەمرۆ پیی ئەلین کافرو، داستانی زۆر لە بارەی فیزو کافری و زیندیقی‌یەوە ئەگیرنەوە". ئەنجا ئەلێ: "لە بارەی هۆی هەڵاتنیەوە قسەی جۆر جۆر ئەکرێ. هەندێ ئەلین دەستی کردبوو بە ئاژاوەنانەوە لە نیوان پاشاو براکانیدا کە ویستبوویان لای پاشا لە گەلی رووبەروو ببنەوە.. هەندیکی کەش ئەلین دەستی کردبوو بە دانانی بناغەی مەزەبیکی نوێ و ئەیویست خۆی بکا بە گەورەی دنیایی وڵاتەکە. بێگومان زۆر شتی لە بارەوە وتراوەو شتی زۆر لەوە زیاتری دراوەتە پاڵ کە لە راستیدا بشێ بدریتە پالی. مەلاکان و سەییدەکان و لە سەرووی هەموویانەوە شیخ مارف، هەموو رقیانە لە شیخ خالید کە کاتێ کە دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو هەمووی بەزاندبوون..".

(سەرچاوەی پیشوو، لاپەرە 227-228).

سەرچاوەی پیشوو لاپەرە 103

**کتیبی یادی مەردان بەرگی یەکەم**

**لاپەرە (43-50)**

# عەقیدەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی

محمدی مەلا کریم
ساغی کردوەتەوەو پیشەکیی بۆ نووسیوەو پەراویزی بۆ کردوە



**پیشەکی:**

ئەمە نامیلکەیەکە، وەك نووسەرەوەکەی لە پیش دەست پێ کردنی تیکستەکەیەوە نووسیویە، ناوی (عقیدەنامەء کردیە) و، وەك لە پاش لێبوونەوەیەوە نووسیویە، (عقیدەء کردیە)یە. هەرکامیان بێ یا نەبێو، ناو بە فارسی بێ یا بە کوردی بووبێ، ئەبێ لەناو خەلکدا یا بە (ئاقیەی مەولانا) یا بە (ئاقیەی کوردی) مەشهور بووبێ. ئەم نامیلکەیە، وەك لە داوینی دەسنووسەکەیەوە نووسراوە، دراوەتە پاڵ مەولانا خالیدی نەقشبەندی[1] و، وەك بە بارو دۆخی سیاسی و کولتووریی ئەو سەردەمەو لە هەلسووران و چالاکیی مەولانا خالید خۆیشیدا دەرئەکەوێ، ئەو درانە پالە راستەو نامیلکەکە هیی مەولانایە.

کەواتە یەکەمی دوو کۆنترین پەخشانی کوردی بە دیالیکتی کرمانجیی خواروو– ناوچەی سلیمانییەو، لەگەڵ مەولوودنامەکەی شیخ حوسەینی قازی[2]، بە جووتە، ئەستیرەی دانانی بەردی بناغەی پەخشانی کوردییان بەسەر شانەوەیە، هەرچەند مەلوودنامەکەی شیخ حوسەین، شان بە شانی ئەوە، لە بارەی هونەرییشەوە زۆر بالأیەو گەیشتوەتە پایەیەکی ئیجگار بەرزو بلند.

لە بارەی ناوەڕۆکەوە ئەم نامیلکەیە شتیکی ئەوتۆی تیا نییە زیاد لەو شتانەی لە دەیان سەرچاوەی تری عەرەبی و فارسیی ئایینیدا هەن. بایەخی راستەقینەی ئەم نامیلکەیە لەوەدایە یەکەمین هەنگاوە بە ریگای جێبەجێکردنی داخوازییە گیانی و کولتوورییەکانی کۆمەلەی کوردەواریدا بە زمانی خۆی، چونکە هیچ رەوا نییە گەلیك تەنانەت بۆ زانینی باوەر و داب و نەریتە ئایینییەکانیشی پەنا بەر زمانی بیگانە بەرێو، بە زمانەکەی خۆی کەرەستەیەکی لە دەستدا نەبێ. بەلکو لەم مەیدانەدا ئەم نامیلکەیە هەنگاویکی تریش بۆ پیشەوە چوە، ئەویش ئەوەتە پاش سالەهای باویی شیعری ئایینی بە کوردی، بابەتی ئایین بە پە خشان ئەخاتە بەردەست و بەمە بەردی بنەرەتی دروست کردنی پەخشانی کوردی لە بابەتی ئایینیدا دائەنێ.

لە بارەی شیوەشەوە، وەك هەر هەنگاویکی یەکەم لە هەر مەیدانیکدا، نیشانەی کاڵ و کرچیی پیوە دیارەو، ئەگەر نەلیین هەلەی نووسەرەوە کاری خۆی لەم مەیدانەدا کردوەو تیکستەکەی لە هەندێ شویندا شیواندوە، گەلی هەلەی ریزمانییشی تیا بەدی ئەکرێ کە لە پەراویزەکاندا –ئەوەندەی پیمان زانیبێ– دەسنیشانمان کردوون. ئەمە سەرەرای وشکی و قورسیی دارشتنیش لە گەلی شوینی تردا.



لەگەڵ ئەوەشدا، وەکوو سەرچاوەیەکی کۆن، بۆ دیاری کردنی باری ئەو رۆژەی نووسینی کوردی و چارکردنی گیروگرفتەکانی و بۆ بەدی کردنی سیمای گۆران و بەرەو پیش چوونی زمانی کوردی، شایانی کەلك لی وەرگرتنە.

بۆ نموونە لە خویندنەوەی ئەم نامیلکەوە دەرئەکەوێ کەوا لە سەردەمی مەولانادا، سلیمانی هیشتا دیالیکتیکی جێ گرتووی تیا نەبوە، یا بە واتایەکی تر ئاخاوتنی خەلکی سلیمانی سەر بە دیالیکتیکی تایبەتی نەبوە. شارەکە کە دروست کرا، دیارە خەلکیکی زۆری لە گەلی لای ناوچەی سۆران و بابان و موکریان و هەورامان و سنەو شارەزوور و شوینانی ترەوە تێ خرۆشا. ئەمانە هەموو وەك داب و نەریتی چاك و خراپی ناوچەکانی خۆیانیان لەگەڵ خۆیان هیناوە، زمانی خۆیشیانیان هیناوە. بەکارهینانی هەندێ وشە لەو نامیلکەیەدا کە هەریەکە ناوچەیەکی دیارینو، دانانی هەندێ پاشگر لەسەر وشە کە ئیستا لە سولەیمانی دانانرین و لە شوینی تر هەن، نیشانەی ئەو هەمەرەنگییەی ئەو سەردەمەی شارەکەن.

لەم نامیلکەیەدا تیپی (ئە) بەسەر فیعلەوە نابینرێ کە ئەوەش وا ئەگەیەنێ لەو سەردەمەدا هیشتا ئەو قۆناغی ئاسانکارییە نەهاتبوە پیشەوە کە پاشان (دە)ی سەر فیعلە موضاریعەکانی هەموو کرد بە (ئە).

بەڵام هیشتنەوەی هەندێ تیپی (ت)ی نیشانەی فیعلی موضاریع بە دوای فیعلـەوە و لابردنـی لـە پـاش زوربـەی فیعلـەکان، نیشـانەی ئەوەیـە قۆنـاغی لابردنی ئەو (ت)یانە، لەو سەردەمەدا، نزیك بوە بگاتە کۆتایی.. هەروەها لەم نامیلکەیەدا (دی) لە بریتیی (تر)ی ئیسـتای ناوچـەی سـلیمانییەو، وشـەی (بۆن) بە جارێ نییەو هەر (بین)ەو، (بچووك) هەمووی (پچوك) و (خراپ) هەر (خراب)ە.

لە بارەی رینووسیشەوە نووسینی (گ) بە (ك) و دانـانی سـێ نوختـە لـە سـەری، دەرنەخسـتنی زۆربـەی (و)ی عـەطف و (ی) ی ئیضافـەو، گـەلی جـار دانەنانی (ژیر) و (بۆر)یش لە بریتییان، سەر و ژیر و بۆر کردن بۆ وشە بۆ خویندنەوە بە راستی کە ئیمە ئیستا پیت لە جیاتیی ئەو سەرو ژیرو بۆرانە دائەنیین، تەنانەت نەنووسینی ضەمیری (ی)یش لە دواییی وشەوەو دانانی بە (حەرەکـە) و بەجێهیشـتنی بـۆ فـامی خوینـەرەوەو جاروبـاریش نووسـینی حەرەکەکە، نووسینی (ـە)یەکی نووساوی دوایی لە جیاتیی (ی)ی ضەمیری غائیب، دانانی هەلکشاوێ لە ژیر (ی)وە بۆ نیشانەی دریژی (وەك: ی لە رینووسـی کـۆری زانیـاری کـورددا) یـا بـۆ نیشـانەی بۆشـی (وەك: ێ) جویکردنەوەی پیشگر لە ریشەی فیعل وەك لە (بیزانیت)دا.. ئەمانە هەندیکن لەو سیمایانەی زمان و رینووسی ئەو رۆژەمان و، من باوەرم وایە دەسنیشان کردنی ئەو خاسیەتانە لە دەسنووسە کوردییە کۆنەکانمانا بایەخیکی زۆری بۆ نووسینی میژووی گۆران و پیشکەوتنی زمان و رینووسی کوردی هەیە.

من ئەم نامیلکەیەم بە مەبەستی مەیدان نەدانی لە ناوچوونی یەکێ لە کۆنترین نموونـەکانی پەخشـانی کـوردی و ئـایین نووسـین بـە کـوردی و، بـۆ وەفـاداری بـە مـەولانای کەلـەپیاوی کـورد و، بـۆ ئاگادارکردنـەوەی لیکۆلەرەوەکانمان لە کەرەستەیەکی کالی کوردی — ساغ و بڵاو کردەوە. سەد بریا دەرفەتی ئەوە بوایە هەموو لاپەرەکانی ئەسلە دەسنووسەکەیشم لەگەلیدا بە کلیشە بڵاوبکردایەتەوە، بەڵام بۆم نەکرا، دەبا بمینێ بۆ هەلیکی تر.

ئیتر هیوام وایە ئەم بەرهەمە لەم روانەوە جیی خۆی بگرێ و سوودبەخش بێ.

## لە بارەی دەسنووسەکەی ئەم نامیلکەیەوە

دەسنووسـی ئـەم نامیلکەیـە یەکیکـە لـە شـەش نامیلکـەی دەسـنووس و هـەندێ وردە بابـەتی دوعـاو سـەڵاوات کـە تیکـرا لـە یـەك سـەردەمدا نووسراونەتەوەو یەك کەس نووسیونیەتەوەو پیکەوەش جزووبەند کراون و ئیستا بە هەموویان کتیبیکن لە کتیبەکانی کتیبخانەی مەرکـەزیی ئـەوقافی سلیمانی و سەرجەمیان ژمارە 2547–2552 یان لەسەر دانراوە.

روونـووس کـەرەوەی هـەر شـەش دەسنووسـەکە ئیسـماعیل نـاوی کـوری سـلیمانی گەڵالەییـە و[3]، سـلیمانیش– وەك کـاك مـەحموود ئەحمـەد موحەممـەدی بەریوەبـەری کتیبخانەکـە پیـی وتم و هـەر خۆیشـی بـوو لـەم دەسنووسانەی ئاگادار کردم و ئەم نامیلکەیەی بۆ وینە گرتمەوە —بە گویرەی ئـەوەی لـە داوینـی قورئانیکـەوە نووسـراوە کـە ئیسـتا لـە کتیبخانـەی مووزەخانەی عیراقدایە لە بەغدا، کوری سۆفی رەبەنەو، ئیستاش باخیك لە گەڵالە هەیە پیی ئەلین (باخی سۆفی رەبەن).

نامیلکەکانی ناو ئەم کۆمەلە دەسنووسە بەریز ئەمانەن:

1–کیمیـاء السـعادة کـە لـە 16ی سـەفەری 1294 (1877/3/3)دا نووسراوەتەوە.

2–عقیدەنامەیەك بە عەرەبی کە لە کتیبیکی ئیمامی نەوەوی وەرگیراوە.

3–عیقدەنامەء کردیە کە ئەمەی بەردەستمانە.

4–نامیلکەیەك لە بابەتی ئەحوالی شیخی و مریدی بە فارسی.

5–نامیلکەیەك لە باسی حەجدا بە فارسی[4].

6–نامیلکەیەکی دوعاو سەڵاوات کە لە 29ی جومادی یەکەمی 1294 (1877/7/11)دا نووسراوەتەوە. کەواتە ئەبێ ئەم نامیلکەیەی مەولانایش لە نیوان مانگی سەفەرو جومادی یەکەمی ئەو سالەدا نووسرابیتەوە.

لە داوینی (عقیدەنامە کردیە)کەوە ئەم چەند دیرە نووسراوە: "تمت کتاب عقیدەء کردیە از مصنفات حضرت مولانا خالد رحمە الله، از دست اسماعیل گلالە برای نور چشم شیخ عثمان القادری[5] مبارکش باد. آمین". واتە: کتیبی عەقیدەی کوردی کە یەکیکە لە دانراوەکانی مەولانا خالید رەحمەتی خودای لی بێ، بە دەستی ئیسماعیلی گەڵالەیی تەواو بوو بۆ نووری چاوم عوسمانی قادری، خوا بکا پیرۆزی بێ".

### بسم الله الرحمن الرحیم
### و بە نستعین

ئەگەر کەسێ دەپرسیت ئیسلام چییە؟ ئیسلام پینج روکنی هەیە، لەسەر هەموو موسولمانێ عاقڵ و بالغ بێ واجبە بیزانیت، عەمەلیشی پێ بکا. ئەو وەڵ ئەوەتە (أشهد): بەدڵ دەزانم بە یەقین بە زوبان دەلیم بە ئیختیار (أن لا لا الە): هیچ مەعبوودێ بە حەق نییە لایق بە پەرستن بێ (الا الله) ئیلـلا ئـە و زاتە[6] نەبیت واجبە بوونی، بێ میثلە، هەموو سیفەتی کەمالی هەیە، هیچ نەفسی نییە، ئیسمی ئەللایە[7]. (و أشهد) هەم بە دڵ دەزانم بە یەقین، بە زوبان دەلیم بە ئیختیار (أن محمدا) بە حەققەت ئەو موحەممەدە[8] ئادەمییە[9]، عەرەبییە، قورەیشییە، هاشمییە، روومەتی زەریفە، برۆ راکشاوە، چاو رەشە، ناوچاوان پانە، رەنگی لە مابەینی سوورو سپیدایە، نە زۆر نەوییە نە زۆر بلندە، لە هەموو ئەولادی ئادەم زەریفترە، بێ سیبەرە، لەبەر نازکی و لەتیفییان دیوار لە روومەتدا– دیارە[10]. تاوی باوك و باپیرانی عەبدوڵلایە کوری عەبدولموطەلیبی کوری هاشمی کوری عەبدولمەناف[11]. ناوی دایکی[12] ئامینە کچی وەهەبی لە تایفەی زوهرەییە[13]. لە مەککە بەوەلەد بووە. خودا کردوویەتی بە پیغەمبەر بە فەزلی خۆی. چووەتە مەدینە وەفاتی کردووە ئەمە کێیە وە هایە؟ رەسوولوڵلایە[14].

رەوانەکراوە، پیغەمبەری خودایە ئەسەر[15] جینن و ئینس بە ئیتفاق، ئەسەر سائیری مەخلووقی تر بە ئیختیلاف.

روکنی دووەمین ئەمەتە بە راستی و بە دروستی، بە سەعی، بە دایمی لە شەو و رۆژیکدا پینج فەرز نویژ بەجێبینی لەگەڵ تەواوی شەرت و روکنانی.

روکنی سیمین[16] ئەمەتە سەرفیترەو زەکاتی مالێ خۆت بدەی لەو چیشتانەی زەکاتیان[17] لی دەکەویت، بیگەیینیت بەو کەسانە[18] زەکاتیان پێ دەشیت بە بێ منەت.

روکنی چوارەمین ئەمەتە مانگی رەمەزان بە رۆژوو بیت بە تەواوی لەگەڵ هەموو شەرتانی.

روکنی پینجەمین ئەمەتە لە هەموو عومری خۆت دەفعەییك[19] رووبکەیە ئەمالی[20] خودای کە لە مەککەیە بە نییەتی حەج و عەمرە بەو شەرتەی تاقەتت ببیت، ئولاغی سواریت ببیت، خەرجی و زەخیرەی ریگەت ببیت، نان و نەفەقەی منداڵانت ببیت[21]، هەتاوەکو دەچی و دیییەوە ریگەت ئەمین بیت.

ئەگەر کەسێ دەپرسێ ئیمان چییە؟ ئیمان ئەمەتە باوەر و یەقینت ببیت بە شەش ئەصڵان لەگەل هەموو لك و تەفصیلان.

ئەصلی ئەوەڵ ئەمەتە باوەرو یەقینت ببیت بە مەعنای لەفزی (الله) کە زاتیکە واجبە بوونی، مەعبوودیکی[22] بەحەققە، ئیجادکەری موتلەقە لە بۆ تەواوی عالەم و عەرش و کورسی و بەهەشت و جەهەننەم و ئاسمان و زەمین و هەرچی لەواندا هەیە. ئەوە بوونی بەخۆوەیە، هەر چشتی دی بوونیان بەوەیە،

ئیجادی كردوون له پاش نه‌بوونیان، ده‌یشیانباته‌وه فه‌نای له پاش بوونیان. له پیش هه‌مواندا بووه. له‌گه‌ڵ هه‌موانیش هه‌یه.

له پاش هه‌موانیش ده‌بیت. هه‌موو سیفه‌تی كه‌مالی هه‌یه. هیچ نه‌قسی نی‌یه. چاوپێكه‌وتنی له دنیا جائیزه، واقیع نه‌بوه، له قیامه‌تدا ده‌بیت به بیچوونی. هیچ میثل و نه‌ظیر و دایك و باوك و ژن و فرزه‌ندی نی‌یه. له هه‌موو جیگاییك له‌گه‌ڵ هه‌موو كه‌س و هه‌موو چشتان هه‌یه. له ره‌گی به‌ده‌ن نزیكتره. كه‌س نازانیت به‌و نزیكی‌یه چلۆنه له ذات و صیفات و فیعلدا ته‌نهاو بێ شه‌ریكه. قه‌ت ناگۆریت. ناوی پاكی بێ حیسابه‌و بێغایه‌ت. چه‌ندانكی هه‌زارو یه‌كه به شوهره‌ت، نه‌وه‌دو نۆیه به كیتاب و به سوننه‌ت[23]. هه‌فت[24] یا هه‌شت سیفه‌ت زاتی ئه‌زه‌لی هه‌موو وه‌ك زاتی خۆی بیچونن هه‌یه‌تی، هیچیان وه‌ك سیفه‌تی مه‌خلووقاتی نین، به قیاس و به عه‌قڵ ده‌رك ناكرین، ئه‌مما نیشانیكی[25] له‌و سیفه‌تانه له زاتی ئینساندا ئیجاد فه‌رمووه‌دا یه‌كیكیان بزانن. ئه‌مما حه‌قیقه‌ته‌ن[26] كه‌س نه‌یزانیوه‌و نایشزانن. سیفه‌تیكیان[27] ئه‌مه‌ته[28]: زینده‌وه، زانینه[29]، خواهیشته توانینه، بیستنه، دیتنه، قسه‌كردنه. به‌عزیكی ئیجادكردنه‌و[30] باقی مانیشیانی[31] گوتووه. ئیجادكردووی كه‌متره له توانینی. هه‌موو عاله‌م موحتاج به‌وی‌یه. ئه‌و بێ ئیحتیاجه.

ئه‌سلی دووه‌م ئه‌مه‌ته باوه‌ر بكه‌ی به مه‌لائیكه‌ی خودای ته‌عالا كه هه‌موو جیسمی له‌طیفن، نوورانین، ده‌توانن خۆیان بنوینن به گه‌لیك شكڵان. هه‌موو عه‌بدی خودان، نه وه‌له‌دشنی نه كچنی[32]. قسه‌ی كافران درۆیه. هه‌موو دۆستی خودان، له ئه‌مری ویدان. هیچ گوناه و نافه‌رمانی و مێیی و نیری‌یو[33] ژن و میردایه‌تی‌یان نی‌یه. ئه‌مما به قه‌ولی عه‌بدوللاَ كوری ئیمامی عه‌بباس (رضی الله عنهما) تایفه‌یه‌كیان هه‌یه (جین)یان پێ ده‌لین وه‌له‌دیان ده‌بیت، شه‌یتان له‌وانه. له هه‌موو مه‌خلووقان زۆرترن. له‌به‌ر زۆری‌یان خودا نه‌بێ هیچ كه‌س نایزانێ چه‌ندن. له هه‌موو ئاسمانان جیی[34] پێییك نی‌یه كه یه‌كیك له‌وان له‌و جیگه‌دا یا له ركووع یا له سوجده‌دا نه‌بیت. هیچ چشتیك نی‌یه نه له ئاسمان نه له زه‌میندا كه مه‌لائیكه‌ییكی له‌سه‌ر ته‌عیین نه‌بێ به ئه‌مری خودا ئاگای لی بیت بینیته[35] عه‌مه‌ل. هه‌موو واسیطه‌ن له به‌ینی خالق و مه‌خلقوودا به عضی واسیطه‌ن له‌بۆ هه‌ندیك له خۆیان. هه‌ندیك ره‌وانه كراون له‌سه‌ر هه‌ندیمك ئینسانان به پیغه‌مبه‌ری. هه‌ندیكیان دایم له روكووعدان. هه‌ندی دایم له سه‌جده‌دان، غه‌رقی حوضووری خودان ئاگایان له هیچ نی‌یه. هه‌ریه‌كێ جیگای خۆی مه‌علوومه، ناتوانن ته‌جاوز بكه‌ن. دوو دوو، سێ سێ، چوار چوار په‌ریان هه‌یه. هه‌ندیك قاپی‌یه‌وانی به‌هه‌شتن، گه‌وره[36]، (رضوان)ی ناوه. هه‌ندیك قاپی‌یه‌وانی جه‌هه‌ننه‌من، گه‌وره‌یان (مالك)ی ناوه. نه‌سته‌قچیی جه‌هه‌ننه‌می به قه‌ولیك له‌و قاپی‌یه‌وانه‌ن[37]، نۆزده كه‌سن یا نۆزد تایفه‌ن. (كرام الكاتبین) چوار شه‌خس، دوو له شه‌ویدا، دوو له رۆژیدا. یه‌كیكیان له‌سه‌ر شانی راستێیه خیران ده‌نووسیت، یه‌كیكیان له‌سه‌ر شانی چه‌پی شه‌ران ده‌نووسیت. ئه‌وی له‌سه‌ر شانی چه‌په له ئه‌مری ئه‌وی له‌سه‌ر شانی راستیدایه. مونكیرو نه‌كیر مه‌له‌كی سوئالی عه‌ذابی قه‌برن له بۆ موسولمان و كافران، لاكین هه‌ندیك موسولمانان موبه‌ششیر و به‌شیریان پێ ده‌لین، هه‌ندیكیان فه‌ضلی هه‌یه به‌سه‌ر هه‌ندیكیاندا. ئه‌فضه‌ل و چاتری مه‌لایكه‌تان چوار شه‌خسن، چوار تایفه‌ن. یه‌كیك له چوار شه‌خسه‌كان جیبره‌ئیله (علیه السلام) هه‌رچی خودا پیی[38] فه‌رمووه گه‌یاندوویه به پیغه‌مبه‌ران به ئه‌مینی. دووه‌مینیان حه‌زره‌تی میكائیله (علیه السلام) رزق و رۆژی و ته‌نگانی و فراوانی و[39] مه‌خلووقی رووی ئه‌رزی به‌ده‌سته. سیمینیان[40] حه‌زره‌تی ئیسرافیل (علیه السلام) نه‌فخی صووری به‌ده‌سته دوو جار پفی پیدا ده‌كات. به جاری ئه‌ووه‌ڵ هه‌رچی زیندووه ده‌مریت غه‌یری خودا نه‌بێ. به جاری دووه‌مین هه‌رچی مردووه زیندوو ده‌بیته‌وه. چواره‌مین حه‌زره‌تی عیزرائیله (علیه السلام) رۆح كیشانی به‌ده‌سته. تایفه‌ی ئه‌وه‌له‌مین ئه‌وانه‌ن عه‌رشیان هه‌لگرتووه. غه‌یری ئه‌و چوار كه‌سه ئه‌و تایفه‌ی عه‌رشیان هه‌لگرتووه، ئه‌وانیش له پاشان ده‌مرن. ئه‌م چواره‌ن له قیامه‌تدا دین(41) به به‌هه‌شت داخڵ ده‌بن. تایفه‌ی دووه‌مین ئه‌وه‌ن نزیكن به باره‌گاهی خودای ته‌عالا. تایفه‌ی سیمین(42) فریشته‌ی عه‌ذاب و سه‌رداری مه‌لایكانن. تایفه‌ی چواره‌مین فریشته‌ی ره‌حمه‌تین. ئه‌م چوار كه‌سان و چوار تایفانه فه‌زلیان هه‌یه به‌سه‌ر هه‌موو مه‌لایكه‌تانه‌وه. غه‌یری ئه‌و چوار كه‌سانه و ئه‌و چوار تایفه عاممی مه‌لایكه‌تان فه‌زلیان هه‌یه به‌سه‌ر گوناهكاری ئینسانانه‌وه. به نه‌فخه‌ی دووه‌مین هه‌موو زیندوو ده‌بنه‌وه ئه‌وان نه‌بن، ئه‌وان له پیشدا زیندوو ده‌بنه‌وه به ئه‌مری خودای ته‌عالا. له‌ورا ئه‌م بزورگانه له ئه‌صلی ئیجادكردن و رۆح له‌به‌رخستنیان له پیش هه‌موو ذی رۆحیكدا بووه، مردنیشیان له پاش هه‌موان ده‌بیت.

ئه‌سلی سیمین[43] ئه‌وه‌ته باوه‌رو یه‌قین بكه‌ی به هه‌موو كوتوبی خودای ته‌عالا كه ره‌وانه‌ی كردوونه خواره‌وه ئه‌سه‌ر هه‌ندیك له پیغه‌مبه‌ری خۆی به ئه‌مه كه هه‌موو كه‌لامی قه‌دیمنن صیفه‌تی قائیمن به ذاتی خودای ته‌عالاوه، مه‌خلووق نین، هه‌موو حه‌ققن، هه‌رچی له‌واندا هه‌یه راسته هیچی درۆ نی‌یه، قورئان هه‌مووی بردوه‌ته پاشه‌وه، له هه‌موان چاتره. به ئه‌مه كه هه‌ر له ئه‌ییامی ره‌سولوللاَوه تا ئیمرۆ و هه‌رتا دنیاش ده‌بریته‌وه به بێ زیادی كه‌می‌یه‌و غه‌له‌تی نی‌یه. عیلمی ئه‌وه‌لین و ئاخیرینی تیدایه. گه‌وره‌تری موعجیزاتی ره‌سولوللاَیه[44] (صلی الله علیه وسلم)، ئه‌گه‌ر هه‌موو جینن و ئینس گردببنه‌وه، ناتوانن كه‌لامیكی[46] وه‌ها بلیین. كوتویه‌كان هه‌موو صه‌دو بیست و چوارن[46]، ده‌یان هاتوونه سه‌ر ئاده‌م پیغه‌مبه‌ر، په‌نجایان هاتوونه سه‌ر شیث پیغه‌مبه‌ر، سی‌یان هاتوونه سه‌ر ئیدریس پیغه‌مبه‌ر، ده‌یان هاتوونه سه‌ر ئیبراهیم پیغه‌مبه‌ر. ئه‌مانه صوحوفن. ته‌ورات به مووسا پیغه‌مبه‌ر، زه‌بوور به داوود پیغه‌مبه‌ر، ئینجیل بۆ عیسا پیغه‌مبه‌ر، قورئان بۆ موحه‌ممه‌د (صلی الله علیه و سلم) هاتووه.

ئه‌سلی چواره‌م ئه‌مه‌ته باوه‌رو یه‌قینت ببێ به هه‌موو ره‌سوولی خودای ته‌عالا، كه ره‌سوول له ئینسانی میرد ده‌بێ، ئازادو چاتر و بێ عه‌یب و عیلله‌ت تر له هه‌موو كه‌سی ئه‌ییامی خۆی. پیغه‌مبه‌ر نین له پیش پیغه‌مبه‌ریدا. له پاشانیش هیچ گوناهی گه‌وره‌و پچووكی[47] نین، شه‌ریعه‌تیكی[48] ره‌وانه كرابیته سه‌ری ئه‌مری پێ كرابێ بیگه‌یینێ به خه‌لقی. دیسان ئه‌گه‌ر ئه‌و ئه‌مره‌ی پێ نه‌كرابێ ئه‌وه نه‌بی‌یه، ره‌سوول نی‌یه.

باوه‌ركردن به ره‌سوولان ئه‌مه‌ته كه بزانی خودای ته‌عالا هه‌مووی هه‌لبژاردوون به فه‌ضلی خۆی، نه‌وه‌ك له‌سه‌ر رۆژوو و ریازه‌ت و تاعه‌تیان، له‌بۆ پیغه‌مبه‌ری. ریی[49] نیشان داون به خه‌لقی– نیشاندانی ئه‌مری دین و دنیایان، هه‌رچی پییان فه‌رمواوه[50] گه‌یاندوویانه به خه‌لقی به سه‌عی و ته‌واوی. چه‌ندانكو[51] دوشمن و لۆمه‌كه‌ریان زۆر بوون، خودای ته‌عالا یاریده‌ی هه‌موانی داوه به موعجیزاتی ئاشكرادا شاهید بن بۆ پیغه‌مبه‌ری‌یان. هیچ كه‌س تاقه‌تی ده‌عوای نه‌بوه تا شه‌ر له گه‌لیان بكا. هه‌موان له قیامه‌تدا به ئیزنی خودای شه‌فاعه‌ت ده‌كه‌ن بۆ گوناهكاران و قبوولیش ده‌بێ، به‌لكو صالح و ئه‌ولیای ئوممه‌تیشیان وه‌هایه. هه‌موویان له قه‌بردا نه‌وعه زیندوی‌یه‌كیان[52] هه‌یه. خاك قه‌دد و به‌ده‌نیان ناخوا. له حه‌دیثدا هه‌یه حه‌ج و نویژیش ده‌كه‌ن. له عه‌ینی خه‌ودا[53] چاو و دلیان به‌خه‌به‌ره. له ئه‌سلی نوبووه‌تدا هه‌موو به‌رابه‌رن. ئه‌گه‌ر كه‌سێ باوه‌ری به یه‌كیكیان نه‌بێ، به هیچ كامیانی نی‌یه. قه‌ت له پیغه‌مبه‌ری ناكه‌ون وه‌ك هه‌ندێ ئه‌ولیا لی كه‌وتوون. هیچ كه‌س نه له ئینسانان نه له حه‌یوانان[54] نه له مه‌له‌كان ناگاته مه‌رته‌به‌ی ئه‌وان. ئه‌مما له‌ناو خۆیاندا هه‌ندیكیان له هه‌ندیكیان شه‌ریفترن. ئه‌و شه‌ریفی‌یه‌یان له‌به‌ر عوموومی ده‌عوه‌ت و زۆریی ئوممه‌ت و عیلم و مه‌عریفه‌ت و ناو و شۆره‌ت و

موعجیزەو یەك لە دوو یەك قایمیی[55] شەریعەتە. لەبەرئەوەیە[56] سەروەری عالەم (صلی الله علیه و سلم) لە هەموان، ئولولعەزم لە رەسوولان، رەسوول لە نەبی‌یان ئەفضەلترن. تەواوی پیغەمبەران بە شۆرەت صەد و بیست و چوار هەزارن. سیصەد و سیزدە یا پازدە لەوان رەسوولن. ئولولعەزمیش پینج شەخسن: نووحە، ئیبراهیمە، مووسایە و عیسایەو موحەممەدە (صلی الله علیه و سلم). ئەو پیغەمبەری مەعلوومن سیی و سێ شەخسن، ناویان ئەمەتە: ئادەمەو، شیثەو، ئیدریسەو، نووحەو، هوودەو، صالحەو، ئیبراهیم و لووطە. ئیسماعیلەو، ئیسحاقە. یەعقووبە و یووسفەو ئەییووبەو شوعەیبەو مووسایە. هاروونە و خضرە و یووشەع و ئیلیاسەو یەسەعەو ذولکیفلەو شەمعوونەو ئیشمەویلەو یوونسە. داوود و لوقمانەو سولەیمان و زەکەرییایەو یەحیایە و عوزەیرە. ذولقەرنەین و سەییدولمورسەلین موحەممەدی عەرەبی‌یە (صلی الله علیه و سلم). ئەمما لە پیغەمبەریی خضر و لوقمان و ذولقەرنەین و ذولکیفلدا قسە هەیە. واجبە کە بیزانی ئیبراهیم خەلیلوللایە یەعنی لە غەیری مەحەببەتی خودای خالی‌یەو، مووسا کەلیموللایە یەعنی گفتوگۆی لەگەڵ خوا کردووە. عیسا روحوللایە، بە کەلیمەی خوا بووە بێ باوك لە دایکی چاترین ئەولادی ئادەم یەعنی موحەممەدی عەرەبی (صلی الله علیه و سلم)، واجبە بزانی یەکیکە لە جوملەی ئەوان، لە کوللی وەجهان تەمیزی و ئەفضەلیی هەیە لە هەموان، چەندانکی ئەو وەجهانە لە حیساب نایەن. یەکیك لەو وەجهانە ئەو وەصف و شەمایلەیە لە ئەووەڵ روکنی ئیسلامدا رامانبوارد، وە هەم ئەمە قەت لە شەراندا نەشکاوە. هەم ئەمە لە پیش هەمواندا لە قەبردا(57) دیتە دەرەوە، لە جیگە حەشر حاضر دەبێ، هەم دەچیتە بەهەشتێ. هەم ئەمە باوەر بکا بە میعراجی ئەو سەروەرە بە هوشیاری لە شەودا لە مەککەوە تا مەسجیدولئەقصا، لە مەسجیدولئەقصا تا سیدرەتولمونتەها بە سواریی بوراقی لەگەڵ حەضرەتی جوبرەئیل چووە، لەویوە بە تەنها رۆیوە تا دەنگی کەلیمەی[58] مەلایکەتانی بیستووە: لەویوە رەفرەفیان بۆ هیناوە بە سواریی رەفرەف چووەتە لامەکان، عەرش و زەمان و مەکانی بەجێ هیشتووە، گەیوەتە حوضووری خودای تەعالا، چاوی پێ کەوتووە وەك لە قیامەتدا چاویان پێ دەکەوێ بە بیچوونی. مەدح و ثەناو گفتوگۆی کردووە. جوابی داوەتەوە بە لوطف و مەرحەمەت. پەنجاە نویژی لەسەر خۆی و ئوممەتی فەرض کردووە، چەند جار هاتوەتە خوارێ بە قسەی مووسا پیغەمبەر چووەتەوە بەرەژوور دیوانی کردوە تا گەیاندوویە بە پینج فەرز. ئەوی خودا دەزانێ، بەو سەروەرە گەیشتووە لەگەڵ چەند هەزار خەڵات و ئیکرام. هاتوەتە جیی[59] خۆی[60] ئیستا گەرم بووە. هەم ئەمە کە گەورەترینی هەموو پیغەمبەرانە، هەر پیغەمبەرێ خوای رەوانەی کردبێ عەهدی لی وەرگرتووە ئەگەر لە پیش مردنیدا بگاتە بە خدمەتی[61] ئەو سەروەرە ئیمانی پێ بینێ. هەم پیغەمبەریتی بە زاتی پر کەمالی ئەوی تەواو بووە. لە پاش ئەوی هیچ پیغەمبەری دی نابن. عیسا پیغەمبەر لەمەو پاش کە دیتە خوارەوە لەسەر دین و شەریعەتی ئەو دەبێ. هەم ئەمە کە رەحمەتە بۆ هەموو عالەم کە هەژدە هەزار عالەمە موحتاجی خوانی نیعمەت و رەحمەتی وین. هەم کە هەر ئەوە رەوانە کراوەتە سەر جینن و ئینس بە ئیتتیفاق، ئەسەر مەلەکان و سائیری مەخلووقاتی دیش بە ئیختیلاف و، پیغەمبەری دی هەریەك لەسەر تایفەییك لە ئینسانان رەوانە کراون. هەم ئەمە خوای تەعالا، بە تەنها فەزل و موعجیزە و کەرامەتی هەموو پیغەمبەرانی داوەتێ و گەلیك چشتی دیش کە بە ئەوانی نەداوە. هەم ئەمە لە پیش هەمواندا ئەو شەفاعەت دەکا. هەم ئەمە موعجیزەو کەرامەتی، خودا نەبێ کەس نازانێ چەندە. هەم شەریعەتی ئەوی هەموو شەریعەتانی بردوەتە پاشەوە.



هەم ئەمە دین و ئوممەتی لە هەموو دین و ئوممەتان چاترن. ئەمما لەناو ئوممەتیدا ئەولیا لە هەموان چاترن و ئال و ئەصحابە



له هەموو ئەوليا چاترن و لەنيو هەمواندا حەضرەتی ئەبووبەكر كوری قوحافە (رضی الله عنهما) له پاش پيغەمبەران چاترينی ئەووەلين و ئاخيرينی ئەولادی ئادەمە، خەليفەيی[62] ئەووەلی رەسولوللایە[63]، لە پيش پيغەمبەريتيی رەسولوللادا خودا پاراستوويە لە كوفرو ضەلالەتان. لە پاش ئەوی ئيمام عومەری كوری خەططابە (رضی الله عنە)، خەليفەی[64] دووەمينە. لە پاش ئەوی ئيمام عوثمانی كوری عەففانە، خەليفەی سيمينە. لە پاش ئەوی ئيمام عەليی كوری ئەبی طاليب (رضی الله عنە)، خەليفەی چوارەمينە. لە پاش ئەوی ئيمام حەسەنی كوری ئيمام عەلی (رضی الله عنهما) خەليفەی پينجەمينە[65].

خەليفەتی كە بەنیيەتی رەسولوللا بووە لەو پينجانە تەواو بووە. موددەتی خەليفەتی سی ساڵ بووە. لە پاش ئەوان ئيمام حوسەين و باقيی عەشەرەی موبەششەرە لە هەموان چاترن. لە پاش ئەوان ئەهلی بەدر، لە پاشان ئەهلی ئوحود، لە پاش ئەوان ئەهلی (بيعة الرضوان) (رضوان الله تعالی عليهم اجمعين). هەم ئەمە هەر كەسێ موسولمان بێ دەبێ جەميعی ئال و ئەصحابی خۆش بوێ لەبەر خۆشەويستيی خوداو رەسووڵی خودای، لەورا ئەو سەروەرە فەرموويەتی هەر كەسێ دۆستی ئەوان بێ دۆستی منيشە، هەر كەسێ دوشمنی ئەوان بێ دوشمنی منيشە. هەر كەسێ ئازاری ئەوان بدا ئازاری من دەدا. هەر كەس ئازاری من بدا ئازاری خودا دەدا. هەر كەسێ ئازاری خودای بدا خودا دەيگرێ. هەم لە حەديثدا هەيە خەديجەو عايشە حەرەمی رەسوولوللا و فاطيمەی كچی لەگەڵ مەريەمی دايكی عيسا پيغەمبەرو عاسيەی[66] كچی موزاحيم چاترينی هەموو ژنی ئەولادی ئادەمن.

هەم ئەمە سەر مەذهەب چوارن: ئيمام حەنيفە[67]، ئيمام ماليك، ئيمام موحەممەدی شافيعی، ئيمام ئەحمەدی حەنبەلیيە (رض الله عنهم). مەذهەبی هەموان حەقە. هەر كەسێ لەسەر مەذهەبی يەكێ[68] نەبێ مەذهەبی دروست

نی‌یە چەندانکو[69] ئیمامی دیش زۆر بوون و هەموو مەذهەبیان حەق بووە، چونکە لە ضەبطدا نین مەذهەبیان، بۆیە جایز نی‌یە عەمەل پێ کردنیان. بە غەیری ئەو چوار مەذهەبەی کە رامانبوارد هەم ئیمامی عەقیدە دوانن: ئەبولحەسەنی ئەشعەری‌یە لە مەذهەبی شافیعیدا، ئەبوو مەنصووری ماتوریدی لە مەذهەبی حەنەفیدا. هەر کەسێ لەسەر عەقیدەی یەکێ لەوان نەبێ عەقیدەی دروست نی‌یە.

هەم طەریقەتی ئەولیا حەققن، لە حەقیقەتدا هیچیان موخالیفی شەریعەت نی‌یە.

ئەسلی پینجەمین ئەمەتە باوەرو یەقینت ببێ بە رۆژی قیامەتێ کە لە ئەووەلی مردنیوە[70] تا ئاخری ماجەرای رۆژی حەشر. بە ئەمە کە هەرچی حەضرەتی رەسوولوللا خەبەری داوە، شەرط و نیشانەو ماجەرای، وەك ظوهووری موحەممەدی مەهدی، هاتنەخواری عیسا پیغەمبەر، خورووجی دەججاڵ و داببەتولئەرض و یاجووج و مەئجووج و سایری ماجەرای دیش هەموو راستە دەبیت بە بێ زیادی و کەمی. هەم بە یەقین بزانی عەزابی قەبر لە بۆ کافرو گوناهکاران هەیە. هەم راحەتیی قەبر لەبۆ موسولمانان و کارچاکان هەیە کە هەر کەس مرد زیندووی دەکەنەوە لە قەبریدا رۆی دەنین، مونکیر و نەکیر دین لیی دەپرسن[71] کە خودای تۆ، پیغەمبەری تۆ کێیە، دین و ئیمامت چی‌یە، ئەگەر جوابی بەدروستی دایەوە قەبری لە بۆ فراوان دەبیتەوە، کولانیکی[72] لە بەهەشتی بە طەرەفی قەبری ئەوی دەکریتەوە، شەو و رۆژ جیگەی خۆی لە بەهەشت چاو پێ دەکەویت، بە گەلیك نیعمەت و بەشارەت بە جیی دیلن و دەرۆن و پیی دەلین (نم کنوم العروس)[73] یەعنی بۆ خۆت بنوە بە میثلی نووستنی زاواو بووکان. ئەگەر لە جوابدا راوەستا بە گورزی ئاگرین کە گورزیکە کە[74] خودای تەعالا لە ئاگری جۆشی دۆزەخ خەلقی کردووە بۆ عەزابی ئەو کەسانەی[75] کە لە دنیادا مونکیری نەصایحی مەشایخی[76] ئەولیایان بێ[77] وە یا بۆ خۆی گونەهکار بێ، وەهای لی دەدەن ئەووەڵ قەبری پر دەبێ لە ئاگر، سەرتاپای بەدەنی دیتە جۆش. بەعد ئەزان[78] بە غەیری جینن و ئینس نالەی ئەوی دەبیین[79]، قەبریش وەهای دەکوشیت[80] پەراسوی راست و چەپی تیك دەپەرینێ. وە هەم لە طەرەفی جەهەننەمەوە کولانیکی بۆ دەکریتەوە هەموو ئیوارو سبەینان جیی[81] خۆی چاوپێ دەکەویت لە جەهەننەمێ، بە ئەنواعی عەذابی دیش تا رۆژی حەشرێ گروفتار دەبیت.

هەم باوەر بکەی دەفعەییکی دی هەموو مەخلووقی لە پاش رزینیان و جوێ بوونەوەی جوملەی ئەعضایان خودای تەعالا گردیان دەکاتەوە، ریکیان دەخاتەوە، رۆحیان بە بەردا دەکاتەوە، لە قەبریدا هەلیاندەستینیت بە قودرەتی خۆی دەیانباتە جیگای حەشرێ، هەموو عەمەل چاکان لە لای راستەوە دیتە دەستی، هەرچی خراپان هەیە لە پشتەوە یا لە لای چەپەوە دیتە دەستی چەپیان. هەموو عەمەلی چاك و خراپ و پچووك و گەورەو ئاشکراو دزی‌یان چ لە دەفتەری عەمەلیاندا بیت، چ ئەعضای خۆیان شاهیدی‌یان لی دەدات[82]، چ لە عیلمی خودادا بیت هەموویان ئاشکرا دەکات، لییان دەپرسیت، جەزای چاکیان دەداتەوە بە چاکی، هیی[83] بە[84] خرابیان[85] بەخرابی. هەم هیندیکیان دەگریت سەبەب بە گوناهیکی صەغیرە بە عەدڵ. لە گوناهی هیندیك گوناهکاران خۆش دەبیت بە غەیری کوفر قەت لە کافران خۆش نابیت. هەم ترازووی قیامەت تای چاکیان نوورانی‌یە لە تەرەفی بەهەشت کە لە لای راستی عەرشەوە دێ. تای خرابیان ظولمەت، ئەوەیە لە طەرەفی جەهەننەمەوە کە لە لای چەپی عەرشەوە دێ. ئەگەر هەموو ئەرزو خرابیانی پێ دەکیشیت. تای گرانی بەرە ژوورە، تای سووکی بەرە ژیرە، مەیلی دەکا بە عەکسی ترازووی دنیای.

پردی قیامەت[87] کە پردیکە لە موو باریکترە، لە تیغ تیژترە، بە ئەمری خودای تەعالا دەینینە سەر پشتی جەهەننەمی، ئەمر دەکەنە هەموان بەسەریدا رابوورن. هەر کەسێ بەهەشتی بێ، هیندیك وەك برووسکە، هیندیك وەك با، هیندیك وەك ئەسپی لنگ[88] بە سەریدا رادەبوورن. هەر کەسێ جەهەننەمی بێ پیی[89] هەلدەخلیسکێ دەکەویتە جەهەننەمەوە، خودای تەعالا وەهای پێ موقەددەرە هەر کەس لە دنیادا لەسەر ریگای شەریعەتدا[90] چاتر رابووردبێ.

هەم حەوضی کەوثەری حەوضیکە ریگەی مانگیك گەورەیە، ئاوی لە شیر سپی ترە، لە میسك بینی[91] خۆشترە. هەرکەس دەفعەیێ بیخواتەوە ئەگەر





چەند ساڵ لە جەهەننەمدا بیت تینووی نابیت.

هەم ئەنبیاو ئەولیاو مەلایکە و صالحان شەفاعەت دەکەن بۆ گوناهی گەورەو پچووکی موسولمانان چەندانکو[92] بێ تەوبە مردبن. شەفاعەت لەو رۆژەدا پینج نەوعە. یەکیك بۆ ئەوەیە زوو حیسابیان لەگەڵ بکەن لە جیگای حەشرێ. دووەمین بۆ ئەوەیە بە سووك و ئاسانی حیسابیان لەگەڵ بکەن. سیمین[93] بۆ ئەوەیە گوناهکاران ناوینە جەهەننەمێ، خەلاصیان بکەن لە عەزاب. چوارەمین بۆ ئەوەیە لە جەهەننەمیيان بینە دەرێ[94]. لە پاش ئەوانە پینجەمین بۆ ئەوەیە مەرتەبەی چاك و عالیی پایە بلندیان بدەنێ لە بەهەشتێ.

## پەراویزەکان:

1-خالیدی کوری ئەحمەدی کوری حوسەینی جافی مکایەلی کە پاشان بە مەولانا خالیدی نەقشبەندیی شارەزووری ناوبانگی پەیداکردوە. مەلایەکی گەورەو شیخیکی پایە بلند بووە. سەفەریکی هیندستانی کردوە بۆ وەرگرتنی تەریقەت لەسەر دەستی شیخ عەبدولڵای دیهلەویدا. لە سالی 1193ی هیجری (1779م)دا لە قەرەداغ لە دایك بووەو لە سالی 1242 (1827)دا لە شام کۆچی دوایی کردوە.

2-کوری سەیید مەحموودی نەقیبی کوری شیخ مارفی نۆدی. لە 1205ی هیجری (1790-1791م)دا لە سلیمانی لە دایك بوە و لە 1285 لە سالی 1935دا لەسەر ئەرکی مەلا عەبدولکەریمی هەکزی لە چاپخانەی نەجاح لە بەغدا لە چاپ دراوە.

3-گەڵاڵە دێیەکە سەر بە ناوچەی ماوەت لە هەریمی شارباژیر لە شارستانی سلیمانی.

4-لام وابێ ئەم دوو نامیلکەیەش هەر هیی مەولانا بن. با ئەوەش بزانین کە مەولانا نامیلکەیەکی بە فارسی هەیە لە باسی ئادابی شیخی و مریدیدا لە شاری قازان لە ناوچەی تاتارستان لە چاپ دراوە، بەڵام نوسخەیمان نەبوو تا لەگەڵ ئەم دەسنووسە بەراوردیان بکەین و بزانین یەکیکن یا جیان.

5-کاك مەحموودی بەریوەبەری کتیبخانەی ئەوقافی سلیمانی ئەلێ ئەم عوسمان ناوە خەلیفەی مەولانا بوە، بەڵام ئەم ناوە نە لە ریزی خەلیفەکانی مەولاناو نە لە ریزی مەنسووبەکانیدا نیيە (بروانەرە: یادی مەردان، بەرگی یەکەم، ل 83-86؛ 116-122). لەمەش بەولاوە ئەگەر لەوە ورد ببینەوە کە مەولانا لە 1242ی هیجریدا کۆچی دوایی کردوەو دەسنووسەکەیش لە 1294دا نووسراوەتەوەو نووسەرەکەیش نووسیویە "برای نور چشم شیخ عثمان القادری" واتە: بۆ نووری چاوم شیخ عوسمانی قادری کە ئەو (نووری چاوم)ە نیشانەی مندالیی شیخ عوسمان ناوی – جگە لە شیخ عوسمانی تەویلە- بووبێ، ئەم شیخ عوسمانەی ئیرە نیيە.

6-لە دەسنووسەکەدا (ذ)ی (ذات) بە (ز) نووسراوە. من پیم زانیبێ ئەمە تاکە تیپیکی عەرەبیيە لەم نامیلکەیەدا بە گویرەی بە دەمداهاتنی لە کوردیدا- نووسرابێ.

7-ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا بەم جۆرە نووسراوە: (اللیة).

8-نووسەرەوە لیرەدا، بە پیچەوانەی شوینەکانی تری لەم چەشنەوە، کە حالەتی فەتحەی دوا پیتی وشە بە (5) ئەنووسێ، (محمد)ەی نوسیوە.

9-کردنی (ئادەمیيە) بە خەبەری (أن) و عەطف کردنەوەی خەبەرەکانی پاشەوەش بۆ سەری، هەلەیە، چونکە خەبەری (ان)ەکە (رسول الله)یە کە پاشان دیت و خراوەتە ناو رستە کوردیيەکانەوە. سەرەرای ئەمەش لەوانەیە کەسیك گومانی بۆ ئەوە بچێ ئەم هەموو صیفەتانە لە لەفظی شەهادەتەکەوە دەرئەکەون، کە واش نیيە.

10-بە نیشانەی ئەوەدا کە وشەی (روومەت) لە دەسنووسەکەدا (زەنە)یەکی بۆ کراوە- کە من لام وایە راستەکەی (روومەتی) بێ- ئەبێ تیکرای نیمچە رستەی (دیوار لە روومەتدا-دیار) خەبەریکی تری پاش خەبەری (ان) بێ.

11-ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا بەم جۆرە نووسراوە: (عبدالمناف). دیارە ئەمە بە پیی دیالیکتی ناوچەی پژدەر و موکریانە کە (ی)یەك دەخەنە سەر (مضاف الیه) و ضەمیری پیوەندی (5) دانانین.

12-لە دەسنووسەکەدا: نووسراوە (دایکە).

13-ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا بەم جۆرە نوسراوە: (زهریە).

14-ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا بەم جۆرە نووسراوە: (رسول اللیە).

15-ئەم (ئەسەر)ە کە بە مەعنای (علی)ی عەرەبیيە، جاران بەکارهینانی لەناو مەلاو فەقیدا زۆر باو بوو. بە داخەوە ئیستا لە زمانی ئەدەبیماندا بەرچاو و گوێ ناکەوێ، بە رای من وەك وشەیەکی رەسەن، شایانی ژیاندنەوەیە.

16-ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا بەم جۆرە نووسراوە: (سمین). دیارە مەبەستی (سێیەمین)ە.

17-لە دەسنووسەکەدا بە هەلە نووسراوە: (ذکاتیان).

18-رستەکەی یا (بیگەیینیتە ئەو کەسانە) یا (بیگەیینیت بەو کەسانە)یە.

19-ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا بەم جۆرە نووسراوە: (دفعیەءیك).

20-راستەکەی (رووبکەیە مالی..)یە.

21-لە دەسنووسەکەدا ئەم (ببیت)ە و سێ (ببیت)ی پیشەوەی بەم جۆرە نووسراون: (بەبیت). لە هەندێ شوینی تریشدا هەر بەم جۆرە نووسراوە.

22-لە دەسنووسەکەدا نووسراوە (معبودیکە).

23-ئەم رستەیە لە بەیتیکی شیعر دەچێ.

24-بەکارهینانی (هەفت) لە جیاتیی (حەوت)ی کوردی، نیشانەی مانەوەی تەئثیری زمانی فارسیيە بە کوردیيەوە لەو سەردەمەدا.

25-لە دەسنووسەکەدا نووسراوە (نشانیك). من ئەوەم بەلاوە هەلە بوو.

26-بە کوردی نووسینی (حقیقة)ە.

27-ئەبوو (سیفەتەکان) بوایە.

28-راستەکەی (ئەمەنە)یە.

29-ئەم عەطفە نادروستە چونکە عەطفی (مصدر) ناکریتە سەر (ذات)، لەبەرئەوە لام وایە (معطوف علیه)یەکە لە راستیدا (زیندوویە) بووبێ، بەڵام لە دەسنووسەکەدا (زیندوە) نووسراوە. ئەوەش هەیە کە زۆر جار لە جیاتیی (ی) (ە) ئەنووسێ، بۆیە دوور نیيە هەر (زیندوویە)ی مەبەست بووبێ و (ی)کەی بە (ژیر-کەسرە)ی (و)ەکە دانابێ و مەبەستی لە (ە)کەیش (ی) بووبێ. ئەشگونجێ رستەکە کە هەمووی راست بێ بەم جۆرە: "سیفەتیکیان ئەمەتە زیندوە"و، سیفەتەکانی تری پاشەوە بەسەرخۆ باس کردبێ.

30-لە دەسنووسەکەدا بەم جۆرە نووسراوە: (ایجاد کردنو). لام دوور نیيە مەبەستی (ئیجاد کردوون و) بێ. ئەگەر وابێ لە عەطفەکەی پاشەوە باشتر ئەگونجێ.

31-ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا بەم جۆرە نووسراوە: (باقی مانیشیان).

لام وایە مەبەستی (باقی مانەیشیانی= باقیماندەیشیانی)یە واتە (ئەوانی کەیشیانی).

32-ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا بەم جۆرە نووسراوە (نە ولدشنی نە کچنی). تارمایی (ژیر)یکیش لە ژیر (د)ەکەو، (زەنە)یەك لەسەر (ش)ەکەو

(چ)هکه به حاڵ و ناحاليك دياره كه لەوانەیه بیکا به (نه وەلەدیشنیو..). بەڵام راستەکەی (نه وەلەدیشینی و نه کچیشینی)یه. خۆ ئەگەر بشلێین (ی)کانی (ولدشنی) به (ژێر)ی (د)ەکەو (ژێر)یکی نیشانه بۆ نەنووسراوی (ش)ەکه پێنه ئەکا، ئەی له (کچنی)دا چۆن که (زەنە)که بوه به تەگەره و (ش)ەکەیش نییه.

33–ئەم دوو وشەیه له دەسنووسەکەدا بەم جۆره نووسراون: (میی و نیریو).

34–ئەم وشەیه له دەسنوسەکەدا بەم جۆره نووسراوه (جی).

35–لام وایه راستەکەی (بینیتیه) بێ.

36–لام وایه راستەکەی (گەورەیان) بێ. پاشەوەش (گەورەیان)ە.

37–راستەکەی (لەو قاپییەوانانەن)ە.

38–له دەسنووسەکەدا نووسراوه: (پی).

39–ئەبێ راستەکەی (فراوانیی) بێ واته لەگەڵ (ی)ی ئیضافه نەك (و)ی عەطف.

40–له دەسنووسەکەدا (سیمنیان) نووسراوه.

41–له دەسنوسەکەدا به هەله نووسراوه (دبن).

42–له دەسنووسەکەدا نووسراوه (سیمن).

43–له دەسنووسەکەدا نووسراوه: (سمین).

44–ئەم وشەیه له دەسنووسەکەدا بەم جۆره نووسراوه: (رسول الليه).

45–ئەم وشەیه له دەسنووسەکەدا بەم جۆره نووسراوه: (کلامکه).

46–راستەکەی (صەدو چوار)ە، وەك له ژماردنی صوحوفەکانیشەوه دەرئەکەوێ.

47–لەم نامیلکەیەدا وشەی (بچووك) هەموو به (پچوك) نووسراوه.

48–ئەم وشەیه له دەسنووسەکەدا بەم جۆره نووسراوه: (شریعتیکه).

49–له دەسنووسەکەدا نووسراوه: (ری).

50–من بەش بەحالی خۆم ئەمه یەکەمجاره ئیسمی مەفعول له مەصدەری (فەرموون) بەم شیوەیه ئەبینم، بەڵام هەلەش نییه.

51–ئەو وشەیەم نه له کوردی و نه له فارسیدا پیشتر نەبیستووه. دیاره لیرەدا به مەعنای (هەرچەند) بەکارهینراوه. رەنگه لەسەر شیوەی (باوەکوو) و (باوەجوو) ئەوانه بێ.

52–ئەم وشەیه له دەسنووسەکەدا بەم جۆره نووسراوه: (زندویکیان).

53–له دەسنووسەکەدا نووسراوه: (خدا) بەڵام هەلەیه. به بۆچوونی من ئەم هەلەیه وا هاتووه: نووسەرەوه (خودا–خەودا)ی به (خدا– خودا) زانیوەو وای نووسیوەتەوه.

54–له دەسنووسەکەدا به هەله (خیوانان) نووسراوه.

55–مەبەستی له (قائیمی)یه واته (بەرپایی).

56–ئەم وشەیه له دەسنووسەکەدا بەم جۆره نووسراوه: (لبراوەء).

57–ئەم (دا)یه زیاده.

58–له دەسنووسەکەدا نووسراوه: (کلمی). راستەکەی ئەبێ (کەلامی) بێ.

59–له دەسنووسەکەدا نووسراوه: (جی).

60–له دەسنووسەکەدا لەم شوینەدا (خوی)ییکی تریش هەیه، بەڵام دیاره زیاده.

61–راستەکەی یا (بگاته خدمەتی) یا (بگات به خدمەتی)یه.

62–له دەسنووسەکەدا (خلیفەیه) نووسراوه.

63–له دەسنووسەکەدا، لیرەشدا ئەم وشەیه بەم جۆره نووسراوه: (رسول الليه).

64–له دەسنووسەکەدا نووسراوه (خلیفەء).

65–له دەسنووسەکەدا نووسراوه (پنجمینه).

66–ناوەکه له راستیدا (ئاسیه)یه.

67–راستەکەی (ابو حنیفه)یه.

68–ئەبوو (یەکێ لەوان) یا (یەکیکیان) بوایه.

69–ئەمه جاریکی تریش (چەندانکو) به مەعنا (هەرچەند).

70–ئەبوو (مردنیوەیه) یا (مردنەوەیه) بوایه بۆ ئەوەی پاشان رستەکه ناتەواو دەرنەچێ.

71–له دەسنووسەکەدا نووسراوه (لیدپرسین). دیاره هەلەیه.

72–له دەسنووسەکەدا نووسراوه (کولانیکه).

73–له دەسنووسەکەدا نووسراوه: "نم کنوم العروس".

74–ئەم (که)یه زیاده.

75–له دەسنووسەکەدا (مشایخ) نووسرابوو که بۆ (مەشایخی)یش و (مەشایخ)یش دەست ئەدا. من (مەشایخی)م پێ گونجاو تر بوو.

76–له دەسنووسەکەدا (اوکسانی) نووسراوه، جا خواه به (ئەو کەسانەی) بخوینریتەوه یا به (ئەو کەسانی) بخوینریتەوه ئەبوو به نیشانەی فیعلەکانی پاشەوەیدا که ضەمیری فاعیلەکەیان بۆ ئەم ئەگەریتەوه– (ئەو کەسەی) بوایه.

77–ئەم حوکمه بەم موطلەقییه تەواو نییه به گویرەی ئایین مەگەر پاش پینەو پەرۆیەکی زۆر. بۆیه ئەبێ هەلەو دەست تیوەردانیکی تیدا روودابێ، چونکه مەولانا کەسیك نەبوه له ئایین بێئاگا بێ.

78–بەعد ئەزان– بعد ازان: نیمچه رستەیەکی فارسییه، واته پاش ئەوه.

79–له دەسنووسەکەدا نووسراوه (دبین).

80–بەمەدا دیاره لەو سەردەمەدا له دیالیکتی سولەیمانیدا نه (وشاردن) و نه (گوشاردن) باو نەبوه.

81–له دەسنووسەکەدا نووسراوه: (جی).

82–ئەبوو (بدات) بوایه.

83–ئەم وشەیه له دەسنووسەکەدا بەم جۆره نووسراوه: (هیه).

84–ئەم (به)یه زیاده.

85–لەم نامیلکەیەدا وشەی (خراپ) هەمووی به (خراب) نووسراوه.

86–له دەسنووسەکەدا نووسراوه (بنیته).

87–ئەم ناونانه گەلی لەوه راستتره که ئیستا باوه، که ئەلین (پردی صیراط) چونکه (صراط) خۆی به عەرەبی واته پرد.

88–لنگ: غار.

89–له دەسنووسەکەدا نووسراوه: (پی).

90–یا ئەم (دا)یه زیاده، یا ئەبێ (لەسەر)ەکەی پیشەوەی (بەسەر) بێ، هەروا له وشەی (قیامەتدا)ی پاشەوەشدا.

91–نالیی شاعیریش له جیاتیی وشەی (بۆن) که ئیستا له دیالیکتی سولەیمانیدا بەکارئەهینرێ، (بین) بەکاردینێ. ئەم وشەیه دەمیکه به تەواوی لەم دیالیکتەدا لەبیرچوەتەوه.

92–ئەمەش (چەندانکو)یەکی تر هەر به مەعنای (هەرچەند).

93–ئەم وشەیه له دەسنووسەکەدا بەم جۆره نووسراوه: (سیمین).

94–له بربرەی دەسنووسەکەدا (دروه– دەرەوه) نووسراوه، بەڵام له پەراویزەوه نووسراوه (دری–ب) واته (دەرێ) له جیاتیی (دەرەوه) دانین.

**سەرچاوە: گۆڤاری کۆری زانیاری کورد بەرگی هەشتەم ژمارە (8) سالی 1981. ل 199-221.**

